# نووسەری کورد

## گۆڤاری یەکێتیی نووسەرانی کورد

ژمارە ( ١٠ ) ، خولی دووەم ، کانوونی یەکەمی ١٩٨٢

سەرۆکی نووسین

د. عیزەدین مستەفا رەسووڵ

سکرتێری نووسین

مومتاز حەیدەری

بارەگای گۆڤار

بغداد ـ الوزيرية

مقابل كلية التربية الرياضية ـ مقر جمعية الثقافة الكردية

چاپخانەی الحوادث.

# جیهـانێکی تایبـەتی

محەمەد فەریق حەسەن

خۆر گەمیەکی شەرابی یە ، رووەو کەلی داراغا شۆڕدەبێتەوە • کۆترە شینکەکانی سەرگومەزو منارەکانی کاك ئەحمەدی شێخ ، پۆلـە شەپۆلی گۆمی دووکانن ، پێکدا هەڵدەپژێن •• خەڵکێکی زۆر بەتایبەت ئەوانەی ماڵیان لەبەرگەی شارە ، رێیان دەکەوێتە ئەم گۆڕەپانە کە لە راستو چەپێکی زەبەللاح دەچێ •• ئێواران لێرەدا پەنگ دەخۆنەوە ، پاسە شەقو شرەکان جۆگەو بناوانیان لێ هەڵدەگرنو دەیانکەنەوە بـە ماڵەکانیاندا •• جارێکی دی دەستلەملانی گوێ ئاگردانی گەرم دەبنەوە• فرۆشیارە دەستگێرەکانیش پەلەیانەو بە بابەتی خۆیانـدا هەڵدەدەن •• لێرەوە ، کەلی داراغا نزیکتر دێتەپێشچاو • لەبەرئەوەی کەیلی بەفرە بەرجەستە خۆی دەنوێنێ • هورووژمی با تاوناتاوێك لە سەردا هەڵدەکاتو مووی لەش دەکاتە دڕکە کەڵەوێ •

هەر پاسێك دەردەکەوێ ، نێرگزە جارێك چاو باوەشی بۆ دەکاتەوە• دارستانێ پاووپووز بەپیرێوە دەچێ ••

بە جانتایەکی سەفەری یـەوە تازەکی مام کەریـم لەناو شـەپۆلی چاوەڕوانی کەراندا خۆی بینی یەوە ••• دەستی بە بەرۆکیدا گێڕاو تـا سەرەوە دوگمەی مرادخانی یەکەی داخستەوە •• « پەکـوو •• هـەر

هەوای ئێرەو هی ئەو گەرمیانە •• ئاسمان‌و ڕێسمان •• خۆ ئەم ڕێگایەش بڕانەوەی نی‌یە » •

چاوێکی بەناو خەڵکەکەدا گێڕا ، ئارام‌و دڵنیایی گەڕانەوە لەشە ماندووەکەی •• لەگەڵ زۆربەیاندا بۆ نۆرەبڕێی پاس ململانێی کردبوو •• لەگەڵ ئەوەیشدا هەموویانی خۆش‌دەویست •• بەتایبەت ئەم ئێوارەیە بە دیداریان هەستی نامۆیی باری شانی سووك‌کردو وای‌زانی لە ماڵی خۆیانە •• شەکەتی‌ی ڕێگاشی بیرچۆوە ••

ئەوەندە نەبێ کزەیەك بە هێمنی کنەی لە جەرگی دەکرد •

دەستەیەك هەرزەکار بەدەم پێکەنین‌و دەمەتەقێوە گەیشتنە وێستگەی پاسەکەو ئاوەدانی‌یان خستەوە •• سەرنجی بە ناویاندا گێڕاو لێیان چووە پێشێ • بۆسۆی هەناسەیەك رووەو ئاسمان سەری‌کرد ••• « هەموویان لەو دەکەن‌و هیچ کامیشیان ئەو نین •• بە بن‌دەستە کتێب‌و وریایی‌و گاڵتەو مەزاقیاتەوە کوت‌ومت ئەون • وەکو تریش هیچیان تام‌وبۆی ئەو نادەن • ناوەڵلا ، هیچیان بڕبڕەی پشتەکەی من نین ••• جا کێ دەڵێ ئێستا لە ماڵەوە وەك جاری جاران بەسەر کتێبێکدا سەری دانەژەندووە •• تۆ بڵێی ئەوە هەرگیز خۆی نەبێ •• نەء لە هیوای برادەری دەکات •• خۆزیا هیوا بوایە ، لەوانەبوو هەواڵێکی خۆشی پێ‌بوایە •• » •

بیری قسەکانی ئەوکاتەی هیوای کەوتەوە :

« پێکەوە لە زانکۆوە هاتینە خوار •• هەر پێکەوەش سەری قەیسەری‌یەکەمان دا • تا ئەو شوێنەی لە قەیسەری‌یەکە دێتە دەرەوەو تێکەڵ بە جەنگەی بازاڕەکە دەبێ پێکەوە بووین ••• بەناو سەوزەفرۆشەکاندا هاتین •• کاتێ لە بەر شارەوانیدا لام‌کردەوە، بینیم

ئەوم لەگەڵدا نی‌یە •• ئەملا هۆگر ئەولا هۆگر •• نەبوو • قەدەرێك لەسەری وەستام ، نەبوو • بەجێی خۆمدا گەڕامەوە • نەمدۆزیەوە••• سەرێکی دی بەوناوەدا چوومەوە ••• ڕەشەرا هاتو چاوم بێی نەکەوتەوە •• » •

گەردنی هەڵبڕی ، پۆلێ کۆترە شینکە لە ترۆپکی منارەکانەوە بۆ سەر گومەزەکە هەڵفڕی •• پۆلێکی‌دی لەویۆە بۆ بان منارەکان •• مام کەریم لە گۆڕەپانەکە دوورکەوتەوە بۆ ناو جیهانە تایبەتی‌یەکەی خۆی •

« توندو تۆڵ بە گوشە زبرەکان دەستوپێ‌یان شەتەكداوە دەیەوێ بەرگری بکاتو بۆی ناچێتەسەر • چونکە چەند بیەوێ خۆی رزگار بکات گوشەکە زیاتر بەلەكو مەچەکی دادەبڕێو لەوانەیە ئێستا گەیشتبێتە سەر ئێسك •• کێ دەڵێ وەها نی‌یە •• » •

قەدەرێك بێ‌هوودە چاوەڕاوی وەڵام بوو •• دیدەی پاسێکی بیستویەك نەفەری هێنایەوە گۆڕەپانەکە •• هەرزەکارێك بە ڕاکردن بەشوێنیەوە بوو ، گۆتێکی لەم داو جانتاکەی لە دەست بەربۆوە سەر قیرە لیتاوی‌یەکە •• زیاتر بەخۆیدا هاتەوە • سەرنجێکی پاسەکەی دا ، فریای نەدەکەوت • لە شوێنی خۆی نەجوولاو بێ‌دەنگەی لێ کرد • بەڵام چاوی لە دەرگای پاسەکە نەگواستەوە • ئەفەندی‌یەکی کەتە بە پاڵتۆو چەترو نایلۆنێك پرتەقاڵەوە ، چەندی کۆشا پێیدا نەچوو • لەگەڵ ڕۆیشتنی لەسەرخۆیدا ، پاسەکە یەقی کردەوەو زانایانە خۆی گەیاندەوە سەرقیرەکە •• بەدەم گورگە لۆقەوە ڕۆیی تاکو خاوبۆوەو دوای چەند هەنگاوێك لە جێی خۆی چەقی •• لەبەر خۆشی‌یەوە هەر دەیمرتاند•• دیاربوو جوێنی بۆ کاکی شوفێر دەنارد ••

مام کەریم قەدەرێك بە قەڵافەتە تێکسمڕاوەکەیدا هەڵیڕوانیو
وردە وردە گەڕایەوە جیهانە تایبەتی‌یەکەی :

« وەك داسكو دەرزی‌ی لێ هاتووە لەخۆیدا مسری گۆشت بوو..
ئێستا چێشتو گۆشتی دەستی حەپسەیشی لێ براوە .. پێستی بەسەر
ئێسکیدا وشك هەڵاتووە .. کەلەکەی ئەوەندەی دی قوپاوە .. ئای ،
ئای .. » .

گڤەی بایەی تەزێنەر کێشی کردەوە گۆڕەپانەکە . چاوی گێڕا
ئەفەندی‌یە کەتەکە نەمابوو .. عەرەبانە دەستگێڕەکانیش بڵاوەیان
لێ کردبوو . دووانی بەرگ بەڵەك بەرەورووی هاتن . مام کەریم زوو
زوو لەمیانەوە روانینی دەگواستەوە سەر ئەویان . جووتێکی ناوچاوان
بە چرچو لۆچ . رەنگ‌دێز .. ئەویان کانە خورمایەك لاروومەتی
وێران کردبوو .. شان‌بەشان لەسەر ئیقاعێك دەهاتنە رێوە . لەئاستی
مام کەریم‌دا خاویان کردەوە . لێك جیابوونەوەو مام کەریمیان دایەناو.
هەریەکەیان لە لایەکەوە لە خۆی‌و جانتاکەی ورددەبوونەوە .

ئەم دیمەنو هەڵس‌و کەوتە ، خەیاڵاتێکی ناخۆشی بەسەردا
هێنا . وردە وردە دووری خستەوە بۆ ژێر زەمینە تاریكو نسێکان .

« لەسەر چیچکان رایان‌گرتووە . تەنێکی درێژکۆلەیان لەژێر
ناوە . بەم زستانە لە شەرمو حەشمەتا ، لە ئارەقەدا شەڵاڵە ، دەپارێتەوە
دوغوڵیان دەبێ ، بێ‌هوودەیە .. جووتێك لەم رەنگو نیشانە بەدیار
سەرێوەن . لەپڕێکدا پێکەوە بەرزەبێ هەڵدەسنەوە .. هەریەکە خۆیان
بەسەر شانێکیدا دەماڵن .. هۆگر ژوورەکە لە دەنگو فیزاح پڕدەکات.
کەچی شەپۆلی دەنگ درِ بەو چوار دیوارە نادات . دەگەڕێتەوەو هەر

له ژووره‌که‌دا کپ ده‌بێ • هۆگر ، به‌ده‌م تاوو تێی شه‌رم‌و ئازاره‌وه ده‌تلیسێته‌وه‌و ره‌هێل ده‌بێ • »

بایه‌کی سارد هه‌ڵی‌کردێ ، به‌ که‌له‌به‌ری جل‌و به‌رگه‌که‌یدا دزه‌ی کرد • موچوڕکێك به‌ له‌شیدا هات‌و چوو • ددانه‌کانی هاڵبوونه‌وه • له‌شی جقه‌ی ده‌رکرد • ته‌نگه‌نه‌فه‌س‌و په‌رێشان ده‌ینواند • دوگمه‌یه‌کی مرادخانی‌یه‌که‌ی ترازاند • سه‌رێك به‌ به‌رده‌م چه‌تره‌که‌دا هات‌و چوو•• سه‌ری هه‌ڵێنا په‌ڵه‌یه‌ك هه‌وری به‌رگن ئاسا به‌رزه‌فڕ تێده‌په‌ڕی•• وه‌ك نیازی بێ له‌دوور بیبارێنێ •• سه‌رنجێ که‌وته‌ شوێنیان •• که‌چی وه‌ك دیارده‌یه‌کی چاوخه‌ڵه‌تێن له‌وه‌ی ده‌کرد مناره‌کان به‌ شینایی ئاسماندا ره‌ت بن •• له‌سه‌ر خۆ که‌وته‌ گه‌زکردنی قیرتاوه‌که‌و گه‌ڕانه‌وه‌ بۆ جیهانه‌که‌ی خۆی :

« وه‌ل به‌ له‌ به‌رچاوم •• ئه‌مانه‌ هه‌ر که‌ منداڵێکیان لی ون بوو ته‌که‌ته‌ك له‌ بنی دنیاوه‌ ده‌گه‌نه‌ سه‌رمان‌و ده‌ماندۆزنه‌وه‌ •• بڕۆ ناوی وه‌هامان له‌ لا نی‌یه‌ •• »

هه‌ستی به‌ ته‌ڕی‌ی لووتی کرد • خۆیشی نه‌یزانی له‌ سه‌غڵه‌تی‌و دڵه‌ی که‌یلێوه‌یه‌ یان له‌به‌ر کزه‌ سارده‌که‌یه‌ • ده‌سته‌سڕه‌که‌ی له‌ باخه‌ڵی ده‌رهێنا • جانتاکه‌ی به‌ شانیدا هه‌ڵواسی •• ده‌سته‌کانی ئاخنی‌یه‌ گیرفانی شه‌رواڵه‌که‌یه‌وه‌ •• تا ده‌روازه‌ی مزگه‌وته‌که‌ چوو • گه‌ڕایه‌وه‌ • به‌ چوار که‌ناردا هه‌ڵیڕوانی ، پاسی گه‌ڕه‌کی خۆیانی به‌دی نه‌کرد •• ده‌یویست زوو بگاته‌وه‌ ماڵه‌که‌ی خۆی •

« تاوێکی دی ده‌گه‌مه‌وه‌ ماڵه‌وه‌ • هه‌ر له‌سه‌ری کۆڵانه‌که‌ ده‌رکه‌وتم ، حه‌پسه‌ به‌ هه‌ڵه‌داوان به‌پیرمه‌وه‌ دێ

— هه‌ر خۆتی پیاوه‌که‌ ؟•• ئه‌ی هۆگر کوا ؟!

— بام پشوویەك بدەم لە نووكەوە بۆت دەگێڕمەوە •
— لەوەتی ڕۆیوی چاوم دەفڕێ •
— ئەگەر بلێی منیش دڵم پێی دەوتم ئیستا لەگەڵ حەپسەدا سەری قسەیان دامەزراندووە •
— ئەوەتا بەشە كفتەكەی هەڵمی لێ هەڵدەسێ •• وتم ئەوا لەپڕ خۆی كرد بە ماڵداو برسی‌ی بوو ؟! » (١)

---

(١) پوورە حەپسە ، تەزبێحێكی ڕەشی درێژی پێیە • بەرمالیك دەكاتە كۆڵی‌و توند لە ملی گرێی‌دەدا ••• كوورِ ، بەڵام زیتەڵ •• ناوبەناو تا دەرگای دەرەوە دەچێ •• سەری بە لای ڕاستو ئەمجا بە لای چەپی كۆڵانەكەدا لاردەكاتەوە • دوای دڵنیایی ، دەچێتەوە ژوورەوە •• دەرگاكەیش كلا دەخات • ئەوە بۆ نزیكەی سالێك دەچێ ، تاكو سەعات نەگاتە دەو هەور زتریش دەرگا داناخات •• لە ژوورەوە سەماوەری تێخستووە قولەقول دەكولێ • لەولایشەوە ، لەسەر خوانێكی بچكۆلە دوو قابلەمە سەریان نراوەتەوە • ئەو خوانو سەماوەرەیش تا سەعات لە دەی هەڵنەبوێرێ كۆناكرێتەوە •

پوورە حەپسە ، چێشتەنگاوان بە زەمیلەیەكەوە دەگاتە بازار • چەندی بۆ هەڵسووڕێ سەوزەو میوەی تێدەكاتو لەژێر عەباكەی دەنێ ، دوو جار لەبەر شارەوانی‌یەوە تا دەرگای قەیسەری‌ی نەقیب دەچێو دەگەڕێتەوە ، چاو ورد دەكاتەوە •• دوایی دەگاتە چایخانەكانی چەقی شار ، یەكەیەكە سەریان پێدا دەكاتو ئەم پرسیارەیان لێ دووپاتە دەكاتەوە : « ئەرێ دایكی خۆت بەسەدەقەی سەرت بێ •• كوڕێ لاوچاك ، تا دەست هەڵبڕی كەڵەگەت ، قژلوول • گەنم ڕەنگ •• روو خۆش •• بن دەستێ كتێبی پێیە •• چاكەتێكی نیلی لەبەرەو پانتۆڵێكی بۆر • داخۆ ئەمڕۆ ڕێی نەكەوتۆتە لاتو چای لێرە نەخواردوەتەوە ؟ »

مام کەریم سەری هەڵێنا •• لە روانینێکدا سەرنجی لەســـەر دیوارەکەی ئەوبەر گیرسایەوە • بە خەتێکی سوور لەسەری نووسرابووە بە رەش کوژابۆوە •• دیسان گەڕایەوە ناو جیهانە تایبەتی یەکەی ••

« ـ کوڕم شەوێ بەخەبەر بووم ، وتم بام لە بەرچاوی هاوڕێکانی بەخۆیدا نەشکێتەوە ئەگینا •••

ـــ بۆچی بابە خوانەخواستە هیچی خراپم کردووە ؟ !

ـــ نەموتووە خراپ کوڕم •• بەڵام حەپســە پێ بــزانێ شــێت و شبر دەبێ •• چاکت کرد تێوارە راستیی سپرایەکەت لا نەدرکاند ، ئەگینا مێشکی کون دەکردم •• دوای ئەوەیش تێ ناگەم ئەنجامی ئەم کارە بە چی دەگات ؟ پێی دەبی بە چی ؟

ـــ شڵەقاندنی گۆمێکی وەستاوە • کە جێ دەستم دیار بــوو ئەوسا هەست بە بوونی خۆم دەکەم •• کە بــە شەقامەکانــدا رەت دەبم وا دەزانم باڵام لە دارتەلەکان بلندترە •• »

مام کەریم بەدەوری خۆیدا چەرخا •• پەنگاوی خەڵکەکـــە تەواو رەویبۆوە •• تاکو تەرا لە وێستگەی پاسەکە مابوون • رێبوارەکان، کە بەلایدا رەت دەبوون گورجتر هەنگاویان هەڵدەگرت • خۆر لەوەدا بو کەلی داراغا ماچ بکات •• سینگی بە هەناسەیەکی قووڵ کشاو دڕی بــە مرادخانی یەکەی دا ••

لە دوور هەرزەکارێك دەرکەوت • تەواو لێی وردبۆوەو رووی تێ کرد •• « ئەوەتا ، جانتاکەیشی لە بن دەستایە •• باڵای ، رەنگی ، رووی گەشی ، رۆیشتنی ، هەمووی ، هەمووی خۆیەتی •• »

مام کەریم نەختێ چاوی گلۆفت و وردتر بۆی روانی •• لەوەدا بوو

جانتاکەی شانی فڕێ‌ىداو باوەشی بۆ بکاتەوە ، کە هەرزەکارەکە پێی‌وت :

— بەخێر بێیتەوە ٠ هەواڵی هۆگرت چنگ کەوت ؟

— ئەمە تۆی هیوا ؟! ٠٠ نازانم بڵێم چی ٠٠ ئەی تۆ ٠٠ لەم ماوەیەدا کە لێرە نەبووم هیچ سۆراخت نەکردووە ؟٠

— بەداخەوە مام کەریم ، هەواڵی نازانم !

مام کەریم تاس بردیوەو سست بوو ٠٠ قەدەرێک بێ‌ئەوەی ورتەی لە دەم دەربێت وشك وەستاو بە جووتێ چاوی کراوەوە سەرنجی دووری دەدا ، ئەمجا پێی‌وت :

— پاس نەماوە ، پێکەوە دەڕۆینەوە ٠

لە دوور منداڵێك دەرکەوت ٠٠ رووەو وێستگەی پاسەکە دەهات‌و هاواری دەکرد : « ریشۆڵە ئەو دانەیەم ماوە ٠٠»

مام کەریم لەو هاوارە درەنگ‌وەختە منداڵانەیە سڵەمی‌یەوەو رووی بۆ لای دەنگەکە وەرچەرخاند ٠٠ منداڵەکە لە بەردەمیاندا وەستا ، لە سەرماندا لێوەکانی وشك هەڵاتبوو ٠٠ ریشۆڵەکەیشی توند لە قولی مستیدا گرتبوو ٠٠ باڵەکانی تەواو کرابوونەوەو ملی بە لارەوە نابوو ٠٠ مام کریم ماوەیەك بە سیمای منداڵەو ریشۆڵەکەدا هەڵیڕوانی‌و ووتی :

— بیدە بە مامی خۆت ٠٠

— دەکاتە سەد فلس ٠

سەد فلسەکەی نایە مستی‌یەوەو ریشۆڵەکەی لە دەست وەرگرت ٠٠ چووە چەقی گۆڕەپانەکەو تا هێزی تێدابوو هەڵیدا ٠٠ ریشۆڵەکە سەرەتا

داهاتەوە ، لەوەدابوو ژێرسکی لە قیرەکە بدات ، بەڵام وردە وردە هەڵسایەوەو رووی لە مزگەوتەکە کرد • چەند جارێك بەلای راستو چەپدا چەرخا دواجار لەسەر گومەزی مزگەوتەکە تێکەڵ بە کۆترەکان بوو ••

مام کەریم هاتەوە سەر پیادەڕەوەکە • دەستی هەڵبڕیو تاکسییەك لایدایە کەنار •• دەرگای پێشەوەی کردەوە •• جانتاکەی لەشوێن پێکانی داناو هێواش دەرگای دواوەی بەیەکدا دا •• دوای چەند هەناسەیەك تەواو دووریخستەوە ★ ••

سلێمانی ـ ١٩٨٢

---

★ بڕیاروابوو بەم چیرۆکە لە دیداری دووهەمی چیرۆکی کوردیدا بەشداری بکەم ، بەڵام لەبەر چەند هۆیەك نەمکرد •

# ناوەرۆكی كۆمەڵایەتی
# لەچیرۆكی «جیهانێكی تایبەتی» دا

**فوئاد مەجید مسری**

« محەممەد فەریق حەسەن » جیهانە تایبەتی یەكەی « مام كەریم » دەكاتە ئاوێنەیەكی باڵانـومای ژانو ئـازارو رەنجەڕۆیی دەیـانی وەك ئەو • دەروازەیەكی گەورە لەسـەر بـاری دەروونیی ئادەمیزادێـك ئەخاتە سەر گازەرای پشت كە بەدرێژایی تەمەنی رەنجیداوەو زەحمەتی كێشاوە تا جگەرگۆشەیەكی پێگەیاندوە ، بـەڵام لەئەنجامـی هەڵسو كەوتێكی دیاركراودا بێسەروشوێن ئەكرێو ئەمیش وەك هەر باوكێكی خاوەن سۆزو عاتیفەی باوكانە لە سۆراخدایە • ئەگەڕێ ، عەوداڵە ، سـەر بە كۆشی دەیان كەسدا ئەكا سوودی نییەو كەس بـە هانایـەوە نایەت ، ئەنجامیش بە نائومێدی لە سەفەرە سەختەكەی دەگەڕێتەوە • بە كۆڵێك خـەمو پەژارەوە لـە چـوار رێیانەكـەی مزگەوتـی گەورەدا بەسەرهاتو كارەساتەكان دەبنە شریتێـكی سینەمایـیو لەسـەر پەردەی مێشكی سەرلەنوێ دەردەكەونەوەو پاشان دەچێتەوە ماڵـەوە • بابەتـی چیرۆكەكە بەگشتی نیشاندانی ئەو بارە دەروونییەیە كە پاڵەوانەكـــە تێیدا دەژی • ژیانی خێزانێكمان دەخاتە بەردەست كە بە كوێرەوەریی ژیان رۆڵەیەكیان پەروەردە كردووەو بـە كـوڵو دڵ چـاوەڕێی ئەو

ڕۆژەن لە بەری ڕەنجی بخۆن • بە هەڵس‌وکەوتی باوکێك ئاشنامـان دەکا لە سۆراخی جگەرگۆشەکەیدا سەر بەهەزار دەرگادا دەکا، بێ‌ئەوەی وەڵامێکی بدرێتەوە • « •• وەل بە لە بەرچاوم ، ئەمانە هەر مناڵێکیان لێ ون ببێ تەکەتەك لە بنی دنیاوە ئەگەنە سەرمان‌و دەمان دۆزنەوە ، بڕۆ ناوی وەهامان لا نی‌یە •• » •

جگەرگۆشەکەی « مام کەریم » ڕۆشنبیرێـکە لە ناوجەرگەی ململانەیەکی توندو تیژدا ڕۆڵـی خـۆی هەیـە • لەئاسـتی دیـاردە ناهەموارەکانی ژیانی جەماوەردا خۆی بێ ناگـیرێ‌و کۆشش ئـەکا • ژیان دەنێتە لاوەو دەبێتە سووتەمـەنی ئاگری ئـەو مەسەلەیەی بـڕوای پێ‌یەتی • ژیانی کۆمەڵ بە گۆمێکی وەستاو دەزانێ‌و پێ‌وایە دەبـێ بشلەقێ ، چونکە تەنها بەو هەڵوێستەی هەست بە بوونی خۆی دەکا • «•• کە جێ‌دەستم دیار بوو ئەوسا هەست بە بوونی خۆم دەکەم • کـە بە شەقامەکاندا ڕەت دەبم وادەزانم بالاَم لە دارتەلەکان بلندترە ••» • سەرەنجامیش کە بەیدەسـت ئـەکرێ خـۆی لەنێـوان مەرگ‌و ژیاندا دەبینێتەوەو حەقیقەتی ململانەکەی چاکتر لا ڕوون دەبێتەوەو بە کردەوە هەست بە ڕەوشت‌و کرداری بەرامبەرەکانی دەکا • « •• لەسەر چیچکان رایان‌گرتووە تەنێکی درێژ کۆلەیان لەژێر ناوە ، بەم زسـتانە لە شـەرم‌و حەشمەتدا لە ئارەقدا شەلاَڵە ، دەپاڕێتەوەو دەغیلیان دەبێ بێ‌هوودەیە •• جووتێك بەم ڕەنگ‌و نیشانە لەپڕێکدا بەرزەبێ هەڵدەسنەوەو هەریەکـە خۆیان بەسەر شانێکیدا دەماڵن ، هۆگر ژوورەکە لە دەنگ‌و فـیزاح پڕدەکا •• » ئەنجام « •• بەدەم تاوتێی شەرم‌و ئازارەوە دەتلێتـەوە » چ‌ئادەمیزادێك دەتوانێ خۆی لە بەردەم ئازارێکی لەوجـۆرەدا بگرێ ، ئەگەر خاوەنی بڕوایەکی پۆلایین نەبێ • چی لەوە جوانترو قەشەنگترە

بابەتی چیرۆکێ ئاوێنەیەکی بێ گەردبێ بۆ نیشاندانی هەڵوێستی ئەو ئادەمیزادانەی لە ناوجەرگەی ژیانێکی پڕ لە کێشمەکێشدا بە هوشیاری یەوە هەڵدەسووڕێن ؟ !

چیرۆکنووس بەهۆی بارە دەروونی یەکەی « مام کەریم » ەوە کە پاڵەوانی چیرۆکەکەیەتی لەم هەموو حەقیقەتە ئاگادارمان دەکا •• ئەو کە وێنەی ئەم جیهانە پڕ لە کارەساتەی گرتووەو بەهۆی پاڵەوانە نادیارەکەیەوەو لە ئاوو هەوایەکی گونجاودا دیمەنێکی تەڵخی ژیانمان دەخاتە پێش چاو ، بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکا ترس‌و بیمێکی ئەوتۆیشی رەنگ ڕشتووە کەس نەوێرێ لە پێستی خۆیدا بجوولێتەوە ، نەبا توندو تۆڵ بە گوشە زبرەکان دەست‌و پێی شەتەك بدەن‌و مەچەك‌و قولەپێی توێخ‌و لوێخیان لێ بێتەوە ! ! ئەم حەقیقەتەیش کاتێك روون دەبێتەوە کە چارەنووسێکی ڕەشی بۆ « هۆگر »ی « مام کەریم » هەڵبژاردووە ، ئەویش وون کردنیەتی • جا ئەگەر ئەنجامی ئەم چەشنە بیرکردنەوەیە هەر ئەمە بێ ، ئەوا خەڵکی هیچ هیوایەکی روونیان بە ژیان‌و رۆڵی جەماوەرو بەردەوام بوونی تێکۆشان نامێنێ‌و ئادەمیزاد ناچار دەبێ لە زاتی خۆیدا خول بخواو بتوێتەوە ، وەك ئەو حاڵەتەی « مام کەریم »ی تێ کەوتووە •

سیفەتی ئەم پاڵەوانە وەك بەئاشکرا لە چیرۆکەکەدا دیارە ، هەر بیرکردنەوەیە لە حاڵەتی کوڕەکەی ، بۆیە چەشنە ناکۆکی یەك لەنێوان باری دەروونی‌و هەڵوێستی کۆمەڵایەتیدا بەدی دەکەین • « مام کەریم » بە هەر نرخێك بێ گەرەکیەتی بە دیداری جگەرگۆشەکەی شادبێتەوە ، لە هەمان کاتیشدا دەزانێ ڕێبواری ڕێگای حەقیقەتە • بەڵام لەوە تێ ناگا کە دەیان باوکی تریش بەوەدەردەوە دەناڵێنن • سەرەڕای ئەمەیش

ناجوو لێ‌و نابێته ئەو باوکە نموونەیی‌یەی کە پێویستە ببێ • بێ‌گومان مەبەست لەم ڕایە ئەوە نی‌یە داوا لە چیرۆکنووس بکەین پاڵەوانێکی سوپەرمانمان بۆ دروست‌بکا ، نەء ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە پاڵەوانێکی نموونەیی ئەوتۆمان بۆ بخولقێنێ کە « لە بارو زرووفێکی نموونەییدا هەڵبسووڕێ » • پاڵەوانێك ژیان‌و ناکۆکی‌یەکانی کاریان تێ‌بکاو ئەمیش کار لە ژیان بکاو جێ‌دەستی دیار بێ • پاڵەوانێك ژیانی خۆی هەر بە تەنها لە دۆزینەوەی کوڕەکەیدا نەبینێ کە مەسەلەیەکی گشتی‌یە ، بەڵکو لەو حەقیقەتەدا بیدۆزێتەوە کە ئادەمیزاد هۆو مەبەستە • هۆیە بۆ گۆڕینی واقیع بە بارێکی باشترداو مەبەستیشە چونکە شیاوی ژیانێکە پڕی بێ لە خۆشی‌و بەختەوەری‌و پێویستەو بگرە مەرجە لە جێگای شیاوی خۆیدا دابنرێ‌و دوور بێ لە ئازاردان‌و چەوساندنەوەو سەرکوت‌کردن •

« مام کەریم » کە هەست بە پراکتیکی ڕۆژانەی کوڕەکەی دەکا ، تێ‌ناگا ئەنجامی ئەم کارەی بە چی دەگاو بۆی ئەبێ بە چی ؟!! • نازانێ چونکە لە حەقیقەتی ژیانی خۆی بێ‌ئاگایە • جا گەر بێ‌و ئەو وتە فەلسەفی‌یەی کە دەڵێ « بوونی کۆمەڵایەتی دەست‌نیشانی هوشیاری کۆمەڵایەتی دەکا » بکەینە پێوانەی ئەم بۆچوونە، دەبێ لە خۆمان بپرسین ئاخۆ هۆگری مام کەریم ، کە ڕۆشنبیرێکی خاوەن پراکتیکی کۆمەڵایەتی‌یە تا چەند توانیویەتی کار لە واقیعی ژیان بکا ، لەکاتێکا جێ‌دەستی لەناو خێزانەکەیدا دیار نەبێ • گومان لەوەدا نی‌یە ، کە ڕۆڵەیەکی لەو جۆرەو بەو هەڵوێستە پیرۆزەوە ، دەبێ ڕۆڵی خۆی لە ژیان‌و بیرکردنەوەی خێزانەکەیدا هەبێ ، بەلام چیرۆکنووس فەرامۆشی کردووە • فەرامۆشی کردووە ، چونکە بایەخێکی لە ئەندازە بەدەری بە جیهانە تایبەتی‌یەکەی مام کەریم داوە واتە جیهانە

سایکۆلۆژیایی‌یەکەی و نەیتوانیوە کەمێك بێ‌هەلبێنێتەوە بۆ جیهانـــە گشتی‌یەکە •

لەبـەر ئەوە هەلوێستێـکی لەوە ئیجابی‌تر لـە مام کەریمـدا بەدی‌ناکەین کە شانازی بە کوڕەکەیەوە دەکا • دیارە ئەمـە لـە ڕووی واقیعەوە راستە ، بەلام ئەرکی نووسەر بەتەنها ئەوە نی‌یە وێنەیەکـی فۆتۆگرافی‌ی واقیع بکێشێ‌و بەس • ئا لێرەوە مەسەلـەی جەوهەریی داهێنان‌و ڕادەی پێوەنـدی نووسەر بە واقیعەوە ، یەکالا دەبێتـەوە • پالەوانی ئەم چیرۆکەمان ئەگەرچی لە بارو زرووفێکی نموونەییدایە ، بەلام خۆی نموونەیی نی‌یە • ئەو جیهانە تایبەتی‌یەی کە ڕەنگدانەوەی جیهانە گشتی‌یەکەیە، کەم‌و زۆر هانی‌نادەن لە پێستی خۆیدا بجوولێتەوە• جـا لەبـەرئـەوەی مرۆڤێـکی ئاسایی‌و سادەکراوەتە پالەوانی چیرۆك ، دەبینین لە نرخ‌و بەهای ئەو جیهانە واقیعی‌یەی نووسەر مەبەستی بووە بی‌خولقێنێ کەم‌بووەتەوە •

کەوابوو ئەو نهێنی‌یە چی‌یە کە بەهۆیەوە نووسـەر دەتوانـێ پالەوانێکی نموونەیی دروست‌بکا ؟•

راستەو نکولی لەوە ناکرێ کە « محەممەد فەریق » بەتەنها شاهیدێك نی‌یە بەسەر رووداوەکانەوەو نایەوێ ژیان بەوجۆرە بـێ کە هەیـە ؛ ڕاستی‌ی ئەم بۆچوونەیش لە دەرخستنی رۆلـی پالەوانـە نادیارەکەیدا بەئاشکرا خۆدەنوێنێ •• بەلام پالەوانی راستەقینەی چیرۆکەکە ، واتە « مام کەریم » ، بەتەنیا لە دەروونی خۆیدا گینگل دەدا ، وەکوتر لە هەموو مەسەلەیەکی کۆمەلایەتی بـێ‌ئاگایە •• بـێ ئاگایە بەومانـایەی بێ‌بەشە لە پراکتیکی کۆمەلایەتی •• هەر لەم روانگەیەوە بۆمان هەیـە رۆشنایی بخەینە سـەر ڕادەی پێوەندی نووسـەر بە واقیعـەوەو پاشـان

ڕادەی بەرجەستەبوونی ئەم پێوەندی‌یە لە پرۆسیسی داهێنانی ئەدەبیـدا دەستنیشان بکەین •

نووسەری ریالیست بۆ هەموو گیروگرفتێکی کۆمەڵایەتی بەپێی حەقیقەتی سەردەمەکەی چارەسەری دروستو گونجاو دەدۆزێتەوە • بە قووڵـی دەچێتە ناخـی کێشـە گەورەکانـی سەردەمەکەی خۆیەوەو جەوهەری دیاردەکان ئاشکرا دەکا • سەرەنجامیش هەروەکو بیروڕاو هەڵوێستی مرۆڤانە سەردەخاو مـوژدەی پاشەڕۆژێـکی باشترو خۆشتر بەگوێی جەماوەردا دەدا ، ئایدیای کۆنو دژ بە رەوتی گەشە کردنی کۆمەڵیش ڕیسوا دەکاو دەیانخاتە سەرەنوێلکی مێژووەوە • ووترا ، پاڵەوانی راستەقینەی چیرۆك لە مەودایەکی چەقیودا گیری خواردووە • ئەو مەسەلـە تایبەتی‌یەی لـە بنچینـەدا مەسەلەیەکـی گشتی‌یە ئارامـی لەبەربڕیـوە • هۆیـە زاتی‌یـەکان تـەواوی هۆیـە مەوزوعی‌یەکانیان لەبیربردووەتەوەو تەنیا ئەوانە کار لە هەستو هۆشی دەکەن بەڕادەیەك لە دەریای خەیاڵو بیرکردنەوەدا بڕستی لێ دەبڕن •

چیرۆکنووس بۆ رەسمکردنی پاڵەوانی دووەمی چیرۆکەکەی کە خێزانەکەی « مام کەریم »ە ، هەمان رێگای گرتووە ، ئەوەتا ئافرەتێکی بێ‌ئاگامان نیشان‌دەدا کە نەك هیچ رۆڵێکی لە ژیاندا نی‌یە ، بگرە بەوەیش قایل نی‌یە کوڕەکەی توخنی شتێك بکەوێ مەترسی لەدوا بێ • حەقیقەتی ئەم هەڵوێستەی خێزانەکەی « مـام کەریم » بـەروونی لـەو دیالۆگەدا دەردەکەوێ کە لەنێوان پاڵەوانو کوڕەکەیدا دەیخوێنینەوە •

« چاکت‌کرد ڕاستی‌ی سپرایەکەت لا نەدرکاند ، ئەگینا مێشـکی کون ئەکردم » •

خۆلقاندنی پاڵەوانی لەوجۆرەی مام کەریمو خێزانەکەی ، نووسەر دەخاتە خانەی ریالیستە رەخنەیی‌یەکانەوە •• چۆن ؟

بێ‌سەروشوێنیی پاڵەوانە نادیارەکەی‌و تاڵو تفتی ژیانی پاڵەوانە راستەقینەکانی ، رەخنەیەکی گورچك‌بڕە لە بارو دۆخێکی کۆمەڵایەتی • نووسەر وەك ریالیستێکی سۆشیالیستی پەیڕەوی ئەو ووتە فەلسەفی‌یە ناکا کە دەڵێ « گرنگ لێکدانەوەی جیهان نی‌یە ، بەڵکو گۆڕینی‌یەتی»، نەخێر • ئەو ، وەك ریالیستێکی رەخنەگر بەتەنها تێ‌روانینێکی رەخنەگرانەی هەیە بەرامبەر بە ژیان •

پاڵەوانەکانیشی لە مەودایەکی چەقیودا گیر ئەخۆن • ئەوەتا « مام کەریم »یك بەو هەموو ئازارو ناسۆرەوە لە پێش‌خواردنەوە زیاتر هیچی لە دەست نایە • دیارە رێنومایی‌کردنی ئەم جۆرە تێ‌روانینە دەبێتە هۆی ئەوەی نووسەر لە کوێرەوەری‌و دەردەسەری مرۆڤی کۆست‌کەوتەو لانەوازو بێ‌دەسەڵات بدوێ • ئەمەیش بنەمایەکی هەیەو لە دوا شی‌کردنەوەدا ئەوە دەگەیەنێ نووسەر لەو زەمینەیەوە ناڕوانێتە ژیان کە پێوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکانی تێدا بەرجەستە دەبن‌و توندو تۆڵ پاڵەوانەکان بەیەکترەوە گرێ‌دەدەن • سەرەنجامیش دەستەوسان دەبێ لەوەی لە بیرو بۆچوون‌و پراکتیکی کۆمەڵایەتی‌یان شارەزا بێ‌و بەوبێ‌یە بیانخاتە گەڕ ؟ دواجاریش یەکێك لەم دوو رێگایە دەگرێ :

یان ئەوەتا تاڵو سوێریی ژیان‌و کوێرەوەری‌و رەنجەڕۆیی ئادەمیزاد ئاوێتەی بەرهەمەکەی دەکاو بەهۆیەوە هەڵس‌وکەوتێکی عاتیفی‌ی رووت لەتەك خوێنەردا دەکا ، لەکاتێکا پێویستە پەرە بە ئاستی هوشیاریی بداو بی‌ووروژێنێ ؟ یاخود جیهانێکی دوور لە واقیع رەسم‌دەکا • بە بڕوای

من « محەممەد فەریق » ڕێگای یەکەمی گرتووە • تیوری ڕەخنەی ئەدەبیی ئەم سەردەمە بایەخێکی زۆر بە لایەنی عاتیفی پاڵەوانی چیرۆك دەداو باوەڕیوایە کە سەرپاکی ئەو وێنە هونەرییانەی کارەکەیان لێ پێك‌دێ بەتەنها بۆئەوە نین ، وێنەی ئەو واقیعە بکێشن کە نووسەر مەبەستییە ، بەڵکو جگە لەوەیش بۆ ئەوەن ئەو پێوەندییە توندو تۆڵەیان بێ دەربڕدرێ کە پاڵەوانی چیرۆك بە واقیعەوە دەبەستێتەوەو دەریدەخا تا چ ڕادەیەك هەستو بیری ئاوێتەی واقیع کردووەو لە پرۆسیسێکی دیالێکتیکیدا پاڵەوان تێکەڵ بە ژیان ژیانیش بە هەموو خۆشیو ناخۆشییەکەوە ، لە بیرو خەیاڵیدا ڕەنگ‌دەدەتەوە •

« مام کەریم »ی پاڵەوانی جیهانە تایبەتییەکە ، سەرفرازیی کوڕەکەی خولیای هەمیشەییەتی • ئەمەیان وەك سۆزی باوکانە مافی ڕەوای خۆیەتیو پێویستە وابێ • بەڵام کە حاڵ بگاتە ئەوەی بەندکردنی باڵندەیەکیش بە تاوانو جورمێکی گەورە دابنێ ، دەڵێین :
لەم حاڵەدا ، نووسەر بەقەدەر ئەوەی تامەزرۆیی پاڵەوانەکەی بۆ ڕزگاربوونی کوڕەکەی دەردەخا ، بەقەدەر ئەوەو زیاتریش تێ‌ڕوانینی نیچمە ڕۆمانسییانەی نیشان‌دەدا • بۆچی ؟!

چونکە لە باری سەرنجی سۆسیۆلۆژیای زانستییەوە ، مەفهوومی سەربەستیی ئادەمیزاد لەگەڵ ئەو سەربەستییەی باڵندەو ئاژەل لە سایەیدا دەژین جیاوازە • لەبەرئەوە ناکرێ ئەو یاسایانەی کۆمەڵ بەڕێوەدەبەن بکرێنە پێوانە بۆ سەرجەمی یاسا سروشتییەکان ••

لە کۆمەڵگای فرەچیندا ڕادەی سەربەستی ئادەمیزاد بەندە بە مەوقیعی چینایەتی مرۆڤو دەسەڵاتی ئەو چینەوە • تەنیا ئەوکاتەیش سەربەستیی تەواو بەرکەماڵ دەبێ کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بچێتە

بارێـکەوە مرۆڤ نەچـەوسێنێتەوە ، یـان ڕاسـتتر بڵێین کـە خاوەندارێتیی سەرنگون بکرێ • تەنانەت ئەو سەربەستی یەی لە ژیانی ئاژەڵو باڵندەدا هەستی پێ دەکرێ ، سەربەستیی موتڵەق نی یە • هەر باڵندەیە باڵندە دەماشێتەوەو هەر ئاژەڵە ئاژەڵی تر قووتدەدا • ئەمە یاسایەکی گشتی یەو چ کۆمەڵو چ سـروشت لە ململانێ بـەدەر نینو دەبێ لـەم ڕوانگەیەوە بۆ مەسەلەی سەربەستی بڕوانین • ئەو منداڵەی بە ئارەزووی خۆی هەڵدەسووڕێ ، یان ئەو مرۆڤەی تووشی نەخۆشیی مێشك دەبێو بە کەیفی خۆیو بێ گوێدانە هیچ یاساو نەریتو ڕەوشتێکی کۆمەڵایەتی دەجووڵێتەوە ، مانای ئەوە نی یە سەربەستن • مەفهـوومی سـەربەستی ئەوەیە مرۆڤ بتوانێ لەو یاسایانە تێبگا کە کۆمەڵو سروشـتو بیـری ئادەمیزاد بەڕێوەدەبەن • کاتێك ئادەمیزاد لە سایەی سەربەستی هەمیشەییدا دەحەوێتەوە کە ئیشـی کرێگرتە لەگۆڕێ نەمێنێو نەبێتـە پارچەیـەك گۆشتی بێلەزەت لە ئامێرێکی ڕەقوتەقدا • تەنها ئەوکاتە سەربەسـتی دێتە ئاراوەو سەرپاکی کۆمـەڵ دەستلەمـلانی بەختـەوەری دەبن کـە بەرهەمی کار بۆ گشت کۆمەڵ بێو بەشێوەیەکی ئاقڵانە دابەش بکرێو شیلەی ڕەنجی هەزارانو ملیۆنان کەس نەچێتە گیرفانی دەستەیەك خەڵکی مفتەخۆرەوە • تەقەللاو کۆششی بەردەوامیش لەپێنـاوی ئـەو چەشـنە سەربەستی یەدا ، هەلو مەرجی خۆی هەیە ، بە واتایەکی تر ، سەربەستی مانای تێگەیشتنو کارکردنە بە یاسا مەوزوعی یەکان •

لێرەوە دەگەڕێینەوە سەر کاکڵەی ئەو مەسەلەیەی پێشتر باسی لێوە کرا ، ئەویش پێوەندیی نووسەرە بە واقیعەوە • یان پێوەندیی دیالێکتیکی نێوان « ذات » و « مەوزوع » • ناوەرۆکی ڕیالیزمی یانەی هەر کارێکی ئەدەبی کە ژیان سەرچاوەیەتی بەم دوو پێوانەیە هەڵدەسەنگێنرێ :

یەکەم : ئایا نووسەر لە دەرخستنی کەسایەتی پاڵەوانەکەیدا هەوڵی

ئەوەی داوە بەپێی یاسای سەبەبی‌یەت ( السببية ) بەهانە بـۆ کـردارو ڕەفتارو هەستو نەستی پاڵەوانەکەی بهێنێتەوە ؟ بۆ وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسیارە بێ‌سێ‌ودوو کردن دەڵێین بەڵێ •

دووەم : ئایا بەهۆی هەڵس‌وکەوتی پاڵەوانەکانی‌یەوە « مام کەریم»و « خێزانەکەی » ، ڕێ‌وشوێنی‌وامان نیشان‌دەدا ، خوێنەر باشتر لە واقیـع تێبگاو هەوڵی گۆڕینی بدا ؟ ! •• لە وەڵامی ئەم پرسیارەیاندا دەڵێین : نەخێر ! •

لەبەر ڕۆشنایی ئەو دوو خاڵـەی سـەرەوەدا ، پوختـەی بیروڕام بەرامبەر بە پاڵەوانی سەرەکی‌ی « جیهانێکی تایبەتی » کە « مام کەریم »ە لەم چەند ڕستەیەدا کۆدەکەمەوە :

گیانی ڕەت‌کردنەوەو ورەبەرنـەدان وەك پێویسـتو لەئـەنجامی حەتمی‌ی کێشەی کوڕەکەیدا بەدی‌ناکرێ • لەوجۆرە کەسانەیە ژیانیان لێ بووەتە دۆزەخ لەکاتێکا سووتەمەنی‌یـەکەی خـۆیەتی • مل‌کـەچی واقیعەو لەو جۆرە کەسانە نی‌یە دەوریان لە گۆڕینی واقیعی خۆیاندا هەیە• « مام کەریم » کەسێکی ئەوتۆ نی‌یە ببێتە نموونەو شایانی لێوە فێربـوون بێ • نموونەیش نی‌یە بۆ ئەو مرۆڤانەی لە ساردیدا گەرمی‌و لە تاڵیـدا شیرینی‌و لە تاریکیدا تۆوی ڕووناکی دەچێنن‌و بە هیوایەکی گەشـەوە چاو لە ئاسۆی ئەرخەوانی دەبڕن ، بێ‌ئەوەی گوێ‌بدەنە ئایـدۆلۆژیای باوو زەبرو زەنگ‌و سەرکوت‌کردن بیان‌تۆقێنێ‌و خـاویان بکاتـەوە •

یەکێك لە مەرجە هەرە بنەڕەتی‌یەکانی هونەری کورتە چیرۆك شێوەی داڕشتنە • دەست‌پێ‌کردن‌و گەشەپێ‌کردنی ڕووداوو پاشـان کۆتایی پێ‌هێنانی ، مەسەلەیەکن ڕاستەوخۆ ڕادەی سـەلیقـەو دەسـت‌ڕەنگینی نووسەر دەست‌نیشان دەکەن • ڕێکخستن‌و ئاوێتەکردنی ڕووداوەکانیش دەبنە هۆی ئەوەی :

یەکەم : خوێنەر بەپەرۆشەوە دوای ڕووداو بکەوێ •

دووەم : ماوە بە چیرۆکنووس نادا شتی نامۆو ڕووداوی بێپێوەندیی ئاوێتەی بەرهەمەکە بکا • جگە لەمانەیش خولقاندنی ئاوو هەوایەکی گونجاو ، جیهانێکی پڕبەپێستی ڕووداو پێکدەهێنێ • دەستنیشان کردنی کاتو شوین کە شێوەی بزووتنەوەی مەتەر « مادە » ن ، مەرجێکیتری ئەمچەشنە هونەرەیە • چونکە ڕووداوی چیرۆك هەرچییەك بێ لە مەودایەکی زەمەنیدا ڕوودەداو جێگەیشی شوێنێکی دیاریکراوە • هیچ ڕووداوێکیش نییە لە چوارچێوەی کاتو شوێن دەرباز ببێ • چیرۆکی « جیهانێکی تایبەتی » تەواوی ئەم هەلو مەرجانەی باسمانکردن تێیدا بەرجەستە بوون •

«محەممەد فەریق» وەك نووسەرێکی بەتواناو بالادەست هیچکام لەم لایەنە هونەرییانەی فەرامۆش نەکردووەو تا ڕادەیەکی زۆریشی کالایەکی ڕەنگینی بە بالای چیرۆکەکەی بڕیوە • ئەوەندە نەبێ لە گەشەپێکردنی ڕووداو « تطور الحدث » دا نەیتوانیوە سەرکەوتنێکی باش بەدەست بهێنێ ، هۆی ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی چیرۆکەکە لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە نووسراوە جیهانی ناوەوەی پالەوانەکەی دەربخا • خۆخواردنەوەی پالەوانیش با لەئەنجامی گیروگرفتێکی کۆمەلایەتیشدا بێ ، چیرۆکنووس والێدەکا نەتوانێ گەشە بە هێلی دراماییی چیرۆکەکە بداو ئەنجامیش ئەم لایەنە گرنگەی هونەری کورتە چیرۆك لەبارئەچێ •

نووسەر بۆئەوەی خوێنەر بەرەو جیهانە تایبەتییەکەی « مام کەریم » ڕابکێشێ وردە وردەو لەسەرخۆ بێئەوەی ئیقاعی چیرۆکەکە بشێوێنێ ، لە بەرگێکی هونەریی شەفافدا هەر زوو زەمانو

زەمینی رووداو دەخاتە بەردەستمان • « خۆر گەمی یەکی شەرابی یە ، ڕووەو کەلی داراغا شۆڕدەبێتەوە • کۆترە شینەکانی سەر گومەزو منارەکانی کاك ئەحمەدی شێخ ، پۆلە شەپۆلی گۆمی دوکانن پێکەدا هەڵدەپژێن • خەڵکێکی زۆربەتایبەت ئەوانەیماڵیان لەپەرگەی شارە ، ڕێیان دەکەوێتە ئەم گۆڕەپانە کە لە ڕاستو چەپێکی زەبەللاح دەچێ •• » بەهۆی وەسفێکی شاعیرانەی چڕوپڕەوە کاتو شوێنمان بۆ دەستنیشان دەکا بێ‌ئەوەی هەست بە زێدەرۆیی بکەین • بە خوێندنەوەی پەرەگرافی یەکەمو دووەمی چیرۆکەکە بۆی دەردەکەوێ : وەرز : زستانە ، کات : ئێوارەیە ، شوێن : گۆڕەپانی بەردەم مزگەوتی کاك ئەحمەدی شێخە • ئنجا پاڵەوان دەکەوێتە ڕوو • بێ‌ئەوەی راستەوخۆ هیچ بە خوێنەر بڵێ ، تەنها بە هیماو بەهۆی مەنۆلۆجێکەوە حاڵیمان دەکا پاڵەوانەکەی تازە لە سەفەری گەرمیان گەڕاوەتەوە • « بە جانتایەکی سەفەری‌یەوە تازەکی مام کەریم لەناو شەپۆلی چاوەڕوانی‌کەراندا خۆی بینی‌یەوە » •• « وەکو هەر هەوای ئێرەو هەوای ئەو گەرمیانە •• ئاسمانو ڕێسمان •• خۆ ئەم ڕێگایەیش بڕانەوەی نی‌یە ••» •

« مام کەریم » بۆکوێ چووەو بۆچی چووە ؟ نازانین • بەڵام هەر زوو دیمەنێکی لەبار دروستدەکاو بەهۆیەوە ڕامان‌دەکێشێ شوێن پێی هەڵبگرینو لێی تێ‌بگەین • کاتێك دەستەیەك قوتابی لە ویستگەی پاسەکەدا سەرنجی ڕادەکێشن دەمودەست بەهۆی مەنەلۆجێکی‌ترەوە ئەڵقەیەکی‌تری شاراوەی ڕووداومان دەداتە دەست • « هەموویان لەو دەکەنو هیچ‌کامیشیان ئەو نین •• بە بن‌دەستە کتێبو وریایی‌و گاڵتەو مەزاقیانەوە کتومت ئەون • وەکوتریش هیچیان تام‌وبۆی ئەو نادەن ، ناوەڵلا هیچیان‌بڕبڕەی پشتەکەی من نین • » • ئێستا گەیشتووینەتە حاڵەتێك بزانین بۆچی ئەوەندە پەرۆشی کوڕەکەیەتی ؟ ! تا ئێرە هەر

هیچ لەبارەی کوڕەکەیەوە نازانین‌و تاڕادەیەکیش تووشی سەرسوڕمان دەبین ، چونکە هیچ بەڵگەیەکمان ناداتە دەست • بینینی قوتابی‌یەکان لە بەردەم ویستگەی پاسەکەدا هەروەك « هۆگر »ی کوڕی بەبیر دێنێتەوە ، قسەکانی « هیوا » ی برادەری کوڕەکەیشی دێنێتەو یاد •• بەوجۆرە خوێنەر تێدەگا کە ماوەیەکە کوڕەکەی بێسەرو شوێنە •

« مام کەریم » بەخۆیدا دێتەوە ، دەبینێ پۆلێ کۆترە شینکە لە ترۆپکی منارەکەوە بۆسەر گومەزەکە هەڵدەفڕن • ئەم دوو دیمەنە ناکۆکە خوێنەر دەخاتە تێڕامانەوەو ناچاری‌دەکا حاڵەتی « هۆگر » و سەربەستی‌ی کۆترە شینەکان بەراورد بکا • ئەم دیمەنە ئەبێتە هۆی ئەوەی پاڵەوان بەرەو جیهانە تایبەتی‌یەکەی بباتەوەو ئەو حاڵەتەی بێتە پێش‌چاو کە جگەرگۆشەکەی تێیدا دەژی •• هوشیار دەبێتەوە • پاسێك دێ‌و ئەم فریای ناکەوێ • لێرەدا چیرۆکنووس بەئەنقەست بەڵام هونەرمەندانە بیانوو بۆ هێشتنەوەی پاڵەوانەکەی دێنێتەوە ، تا لە ماوەیەکی کورتدا بەتەواوی‌و بەهۆی جیهانە تایبەتی‌یەکەیەوە لە کێشەکەی ئاگادارمان بکا• ئەفەندی‌یەکی تێکسمڕاوی کەتە دەردەکەوێ، ئەمیش بە قەڵافەتەکەیدا هەڵدەڕوانێ • داروباری ئەم کابرایە وای‌لێ‌دەکا بگەڕێتەوە ناو جیهانەکەی خۆی‌و هەر لەوێوە شتێکمان سەبارەت بە جوستەو قەڵافەتی کوڕەکەی لە حاڵی حازردا بۆ دەربخا• « وەك داسك‌و دەرزی لێ‌هاتووە ، لەخۆیدا مسری گۆشت بوو •• » ئەم دوو دیمەنەو لە چاوی پاڵەوانەوە کە دەبێتە چاوی کامیراو یەکەم لە دووەمدا دەتوێتەوە ، خۆی لەخۆیدا هونەرێکی سینەمایی‌یە ، بەڵام لە نووسەرو هونەرمەنداو لە شوێنی خۆیداو بۆ زیاتر دەرخستنی بارە دەروونی‌یەکەی سەرکەوتووانە ئەنجامی‌داوە •

« مام کەریم » هەر چاوەڕوانەو لە شوێنی خۆیەتی • لەپـڕ دوو کابرای ناوچەوان چرچولوچو ڕەنگ‌دێز ، چاو خۆڵەمێشی دەردەکەون ، بە جانتاکەیدا هەڵدەڕوانن ، ئەمیش جۆرە ترسێك لە دڵیدا چەکەرە دەکا • دیارە ئەم ترسی لە خۆی نی‌یە ، بەڵام وەك کارێکی هونەری دەیکاتە هۆیەك بۆئەوەی حاڵەتی کوڕەکەی بێتەوە پێش چاو کە چۆن « لەسەر چیچکان رایان‌گرتووەو تەنێکی درێژکۆڵەیان لـەژێر نـاوە ، بەم زستانە لە شەرمو حەشمەتدا لە ئارەقەدا شـەڵاڵە •• دەپاڕێتـەوەو دەغیلیان دەبێ ، بێ‌هوودەیە •• جووتێك لەم ڕەنگ‌و نیشانە بەدیـار سەریەوەن • لەپڕێکدا بەرزەبێ هەڵدەسنەوەو هەریـەکە خۆیان بـە شانێکدا دەماڵن هۆگر ژوورەکە لە دەنگ‌و فیزاح پڕدەکا • » •

« مام کەریم » بەئاگا دێتەوە سەر بەرزدە کاتەوە پەڵەیەك هەور بەدی دەکا • یەکەمجار وای بۆ دەچێ بیبارێنێ ، کەچی وەك دیاردەیەکـی چاوخەڵەتێن لەوە دەکا منارەکان بە شینایی ئاسماندا رەت‌ببن•• بڕوانن•• گەواڵە هەورێکی چاوخەڵەتێن دەیباتەوە ناو جیهانە تایبەتی‌یەکەی ، تا لە جیهانە گشتی‌یەکەدا دیاردەی‌تری چاوخەڵەتێنمان نیشان بدا ، کە چۆن بۆ سۆراخی جگەرگۆشەکەی سەر بە هەر دەرگایەکدا دەکا ، بەڕوویدا کڵوم ئەکرێ • « وەل بە لە بەرچاوم ، ئەمانە هەر منداڵیکیان لێ ون بوو تەکەتەك لە بنی دنیاوە ئەگەنە سـەرمان‌و دەمانـدۆزنەوە ، بـڕۆ ناوی وەهامان لا نی‌یە •• » •• بەرۆشی ئەوەیە زوو بگاتەوە ماڵەوە ، دەچێتەوە نـاو جیهانـە تایبەتی‌یەکـەی‌و وەك بەڕاسـتی ڕووبداو ئـەم بیگێڕێتەوە لە حاڵی خێزانەکەی ئاگادارمان دەکا •

« تاوێکی‌دی ئەگەمەوە ماڵەوە ، هەر لە سەری کۆڵانەکە دەرکەوتم حەپسە بە هەڵەداوان بەپیرمەوە دێ •

ــ هەر خۆتی پیاوەکە ؟ ئەی هۆگر کوا ؟!

ــ بام پشوویەك بدەم ، لە نووکەوە بۆت دەگێڕمەوە •

ــ لەوەتی رۆیوی چاوم دەفڕێ •

ــ ئەگەر بڵێی منیش دڵم پێی‌دەوتم ئێستا لەگەڵ حەپسەدا سەری قسەیان دامەزراندووە •

هیچ شتێك لەبارەی خێزانەکەی « مام کەریم »ەوە نازانین •• نووسەریش هەولی ئەوەی نەداوە تا ئێرە شتێکمان لەبارەیەوە پێ‌بڵێ • ناچار بۆئەوەی پێی ئاشنا بین پەراوێزێك دادەنێ‌و وەسفی پاڵەوانی دووەمی چیرۆکەکەیمان بۆ دەکاو بەهۆیەوە ئاشنای دەبین •• لێرەدا هەست بە دەلاقەیەك دەکەین لە بینای چیرۆکەکەدا •• چونکە بوونی هیچی‌تری نەخستووەتە سەر ڕەوتی چیرۆکەکە ••• ئەمە لەلایەك • لەلایەکی‌ترەوە دەیتوانی خۆی نەخاتە داوی پەراوێز دانانەوە ، بەوەی لەوشوێنەدا کە « مام کەریم » دیمەنی دەرکردنەکەی دێتەوە یاد ، دەیقرتاندو بە مۆنتاجێکی « مکانی » حاڵەتی شپرزەیی دایکی هۆگریشی نیشان دەدایەو کارە هونەری‌یەکەی سەرکەوتووتر دەکرد • نووسەر تا ئێرەیش هۆی بێ‌سەروشوێنیی کوڕەکەیمان پێ ناڵێ • پاڵەوانیش هەر لەجێی خۆیەتی • کت‌وپڕ چاوی بە دیوارەکەی ئەوبەردا هەڵدەواسرێ • دیوارەکە هەندێ شتی لەسەر نووسراوەو کوژێنراونەتەوە • ئەم دیاردەیە دەیباتەوە ناو جیهانە تایبەتی‌یەکەی‌و دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی هەستی بە جموجۆڵی کوڕەکەی کردو ئەمیش بەسەریدا هات •

« ــ کوڕم شەوێ بەخەبەر بووم ، وتم بام لە بەرچاوی هاوڕێکانی بەخۆیدا نەشکێتەوە ، ئەگینا •••

ــ بۆچی بابە ، خوانەخواستە هیچی خراپم کردووە ؟!

— نەمووتووە خراپ کوڕم •• بەڵام حەپسە پێبزانێ شێت‌و شبر دەبێ •• چاکت‌کرد ئێوارە ڕاستیی سپرایەکەت لا نەدرکاند ، ئەگینا مێشکی کون‌دەکردم •• دواى ئەوەیش تێناگەم ئەنجامی ئەم کارە بەچی دەگات ؟ پێی دەبێ بە چی ؟ •• »

بەوجۆرە کلیلی مەسەلەکەمان دەداتە دەست‌و هۆی بێ‌سەروشوێنیی کوڕەکەیمان بۆ ساغ‌دەکاتەوە •• پاڵەوان هەر لە جێی خۆیەتی ••

هەرزەکارێك بەرەولای ئەم دێ ، هاوڕێی کوڕەکەیەتی • دەکەونە گفت‌وگۆو بە چەند دیالۆگێك تێمان‌دەگەیەنێ سەفەرەکەی مام کەریم بۆ سۆراخی کوڕەکەی بووە • نووسەر لەوشوێنەدا کە پاڵەوان دەڵێ :

« پاس نەماوە• پێکەوە ئەڕۆینەوە » دەیتوانی کۆتایی بە چیرۆکەکە بهێنێ ، نەك منداڵێکی ڕیشۆڵەفرۆش بئاخنێتە ناو ئەو دیمەنەوە ، تەنها بۆئەوەی پێمان بسەلمێنێ پەرۆشی سەربەستی‌یەو هەروەك سەربەستی بە کورەکەی ڕەوا دەبینێ ، باڵندەی بەندکراویش ئازاری‌دەداو لای‌وایە هەموو بوونەوەرێك دەبێ سەربەست بژی •• ئەم دیمەنە سەرەڕای ئەوەی بە زۆر ئاخنراوەتە ناو چیرۆکەکەوە ، ڕێکەوتێکە لەجێی خۆیدا نی‌یە ، چونکە ڕێکەوتی رووت نی‌یەو پێویستە چیرۆکنووس ئاگای لەوە بێ کە ڕێکەوت هەمیشە جێبەجێبوونی جۆرێك لەناچاری « ضرورة »یە •

لەم پێداهاتنەوەیەی چیرۆکەکەدا ، کە زۆرتر شەقڵی ڕەخنەی « تطبیقی » گرتەخۆی مەبەستم ئەوەبوو بیسەلمێنم کە :

یەکەم : چیرۆکنووس تاڕادەیەکی باش لە بینای چیرۆکەکەیدا سەرکەوتنی بەدەست‌هێناوە

دووەم : یەکێکە لەو چیرۆکە دانسقانەی لە ڕووی بەکارهێنانی
مەنەلۆجو « فلاش‌باك »ەوە ، دەستڕەنگینی نووسەرەکەی
دەردەخەن بەتایبەتی چونکە بینای چیرۆکەکە لە بنەڕەتەوە
پشتی بەم هونەرە بەستووە ، بەڕادەیەك بۆمان هەیە بڵێین ،
چیرۆکی مەنەلۆجە •

سێیەم : هەروەك پەنای بۆ ئەو شێوازە هونەرییە بردووەو تەلاری
چیرۆکەکەی لەسەر بنیات‌ناوە ، نەهاتووە لایەنەکانی دیکەی
هونەری چیرۆك فەرامۆش بکاو بەتەنها وێنەی ناوەوەی
پاڵەوانەکەی بکێشێ ، ئەگەرچی ناونیشانی چیرۆکەکەیش
« جیهانێکی تایبەتی »یە ؟ نەخێر • سەرەڕای ئەوەیش
ڕۆشنایی خستووەتە سەر کات‌و شوێن‌و مەوداکانی پاڵەوانی
بەخوێنەر ئاشنا کردووە ، بێ‌ئەوەی بکەوێتە داوی ڕاپۆرت
نووسین ، یاخود ورێنەکردنەوە •

بە هەرحاڵ ، پێویست بە دووبارە کردنەوە ناکا ، « محەممەد
فەریق حەسەن» یەکێکە لەو تاك‌و تەرا چیرۆکنووسانەی ئەم سەردەمەمان‌و
بە هوشیارییەوە لە هونەری کورتە چیرۆك تێگەیشتووەو خاوەنی
تاقی‌کردنەوەو قەڵەمێکی بەبڕشتە •

جا ئەگەر لە داهاتوودا توانی تەواوی ئەو بەهرەو سەلیقە
هونەرییەی بەردەوام مشت‌وماڵی دەکا ، بیخاتە خزمەتی ناوەرۆکی
بەپێزترو گەورەترەوەو لە قاوغی ریالیزمی رەخنەیی خۆی دەرباز کردو
رووەو ئەدەبیاتی ریالیزمی سۆشیالیستی بە « هەنگاوی گورج‌و درێژ »
شوێن پێی کەڵە شاعیری ئەم چەرخەمان « گۆران »ی مەزنی هەڵگرت ،

ئەوا قەڵەمی هەموو ئەو رەخنە گرانەی بەپێودانی ئیستاتیکای زانستی بەرهەمەکانی هەڵدەسەنگێنن لەئاستیدا مل کەچدەکەن ، دیارە پێچەوانەی ئەمەیش ئۆباڵی لە ئەستۆی خۆیەتی * ...

---

* بڕیاروابوو ئەم باسەو باسێکی‌تر لەسەر چیرۆکی « خەون و خەم »ی ڕەزا سەیید گوڵ ، لەژێر هەر ئەم ناونیشانەدا لە دیداری دووهەمی چیرۆکی کوردیدا بخوێنرێنەوە . بەڵام لەبەرئەوەی چیرۆکنووس لە خوێندنەوەی چیرۆکەکانی پاشگەز بووەوە ، ئەم‌باسەی منیش تائێستا ڕۆشنایی نەدی ـ ف. م. م.

# هەردوو دیوی پایزی « هەشتاویەك » !

شیعری : جەمال غەمبار

● دیوی یەکـەم

ئەی ئاسمان تۆ
قۆپچەی ئەم پاڵتۆ ڕەشەی خۆت بترازێنە
با لە دەروونی شـینتدا ،
بەژنی سپیی وڵاتەکەم ،
نقووم بـکەم ..
لەژێر باڵی هێمنیشتا ،
بۆ ئەو بژیم ..
بۆ ئەو بمرم ..

★ ★ ★

من کە بۆنی پایز دەکەم ..
لەپێش ئەوەی ، هەناسەی گەرمی لەیلایەك
ئۆخژن بخاتە دەروونی ساردمەوە
وا هەست دەکەم
سەری پڕشکۆی ( سەیوان )م

ناوه بە سنگی ڕەشمەوە
ئەو گردەشی کە لەمێژە
بۆتە هاوسێو دۆستی سەیوان
ژانەشەوی سەدان عاشق ڕادەژێنێ
لە دڵمایەو ،
لە دڵەوە بۆی دەڕوانم ..

* * *

بۆنی پایز دێو
پرووشەی باران ، گیانم تەڕدەکات ..
گەرچی جەستەشم ئاسنی ڕەق بێ ،
هەرگیز وەك دڵی تۆ ژەنگ نایگرێ ..
باران دۆستمەو ،
کاتێ دەبارێ ...
منداڵ دەبمەوەو ، درختەکان لام
وەك خۆمو زۆربەی مناڵە وردکەی ( مەڵکەندی )ی دێرین
بە رووتیو ملکەچ ، دێنە پێش چاوم
پایز ، بۆنی دێو
گەڵاکان دەبنە کراسێکی زەرد
لە زەماوەندی مەرگی خوایەکا ،
زەوی دەیپۆشێ ..
تۆش کراسێکی ڕەشی ئاودامان ،
دەکەی بەبەرتا ..

چەند شۆخ‌و شەنگیت ، کاتێ دەتبینم
سەرپۆشی مردن ئەدەی بەسەرتا ••!

★ ★ ★

بەرامەی تەڕی ئەم وەرزە ،
چەند پایزێ لەمەوبەرم دێنێتەوە یاد ••
پـایزێ بوو ،
تارمایی‌یەکان ، بەشوێن چاوانی ئەسپێکدا
هەڵوەدابوون ••
باڵی چەپی وڵاتێکیان بۆی پشکنی ••
چاڵی سەری خواوەندێکیان ، هەڵدایەوە ••
باخێك نەما ،
کاڵای بەری گوڵ‌و چڵی دارەکانی شیتاڵ نەکەن
ئاوایی دڵی عاشقێ بەدی‌نەکرا ،
دەمی نێزەی تیا نەڕوێنن ••
کۆنتڕۆڵی کەنار شارێ نەمایەوە
پەساپۆرتی چی ڕێبوارە ، نەیپشکنێ ••
چاوەکانیان نەدۆزییەوە ••
بێزاری یەخەی پێ گرتن ••
لە بێزاری‌و پەستی‌یانا ، وایان دەزانی ئەو دەنگە
بۆیە گوێی بنارێك نەما ،
چەقۆ یاریی تیادا نەکا ••
وایان‌دەزانی ئەو تیشکە ،

بۆیە ویستیان خۆر دابگرن •••
« نەیانتوانی ! »

* * *

● دیـوی دووەم

لە هەناوی شیعری منا ، ئەم وەرزە تەڕو خامۆشە
سەرەتای ژانێ بێدەنگەو ،
خۆم نەبێ ،کەس نایناسێتو
لەسەر نەخشەی وڵاتی هەستی هیچ کەسێ
ڕەنگ و نەخشەی بۆ نەکراوە ••
دەزانم لە ناخی تۆدا ،
ڕەنگە ئەم ژانە دیمەنی زستانێ بێ ،
هەزارو یەك تەزووی ئاخو
موچڕکی بێسەرو شوێنی گرێ
لە دەروونتا بخولقێنێ ••

* * *

سەرەتای ژانێ بێدەنگەو ،
گوڵو گیای کەنار ڕووباری دڵم
دەیکەنە هەناسەی گەرمو
هەڵیدەمژن ••

ئازارێکی لەسەرخۆ بووی ،
عەشقت ، پۆلێ مەلی تینوو و برینداری
هۆزانڤانێکی ڕەوەند بوون ..

لەنێو قژی چنارەکانی « گولان »دا ،
هەڵوەدابوون ..
چەمێ ، کانییە ، چۆڕێ ئاو ، بدۆزنەوە ...
« گولان » سنگی بەرینی خۆی دەکردەوە ،
هەر سەرچاوەی ئاوی ڕوون بوو
بۆ باڵندە پێدەکەنی ،
دەشنایەوە !

ئێستا « گولان » چۆن ڕەنگی خوێن دەناسێتو
لەگەڵ سەوزاییی جەستەیا ، دەینەخشێنێ !
ئاواش لە خەمی شاعیرێ دەگاو ،
دەزانێ چۆن ، ژانەکانی ئەو بەردەگرن
دەزانێ چۆن ، لەگەڵ سووتانی خۆیانا
بۆ « گوڵێکی زستانەیی » دڵم دەمرن !

**بەغدا ـ ئەیاوول ـ تشرینی یەکەمی ـ ١٩٨١**

# ئاســـۆ !

نووسینی : ڕەووف حەسەن

— ڕۆڵە •• ئاسۆ •• بەسە ••• ئێوارێیە •• وەرە ژوورەوە •

— بۆ بێمە ژوورێ •• توخوا دایە گیان با هەر لە دەرەوە بین •• ئەی تائێستا ئێمە هەر لەژوورەوە نەبووین ؟!

خەمو پەژارە دایگرتوویـت •• دەڵـێی شتێـکی گرینـگت بزرکردووە •• یا ئەو شتەت لەولا لێ جێماوە •• چوار ، پێنج ساڵە قوربانی بۆ دەدەیتو هەروا بە ختو خۆڕایی لە دەستت چوو ••

چوار ساڵو نیوە نە خۆتو نە ئاسۆی کوڕت ژەمێك تێر ســـکی خۆتان نەخوارد •• سەوزەو میوە نەتانزانی تامیان چۆنەو گوێتـــان نەدایە •• هەناسەیێکی ئۆخەی پڕ بە سییەکانتان هەڵنەمژیو ئاسایـی بوو •• ئاوێنەیێکت نەدی کەزییە خاوەکانتی لەبەردا دابێنیو بەلاتەوە پەشم بوو •• چونکە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئاواتەکانت گەورەترو پیرۆزتر دەبوون •• تا وایلێهات ئامادە بوویت داوێنی خاوێنتی بۆ بگۆڕیتەوە ••

ئاسۆ لە دەرگاکەوە سەری هێنایە ژوورێ •

— ئەی تۆ نەتووت کـە چووینـە دەرەوە هەرچییەکـت ویسـت هەمووت بۆ جێبەجێ ئەکەم •• بە دڵی خۆت •• من حەز ئەکەم لەدەرەوە بمو یاری بکەم ••

باوكی ئاسۆ بە دوو سێ قدڵەمباز پەلاماریداو گرتی‌یە باوەش ••
توند بە دڵی‌یەوە نووساندو تێر ماچی کرد •• ئاسۆ بێزار بوو •• خۆی
ڕادەپسكاندو توانای نەبوو • تۆش وەختبوو دڵت شەق‌بەرێ •• ڕیش‌و
سمێڵە زبرەکەی لە ڕوومەتە زۆر سپی‌و ناسکەکانی ئاسۆ دەچەقی ••
خۆی ڕاپسكاندو لە باوەشتا ئارامی گرت •

— دایە توخوا بەڕاستی پێم‌بڵێ ئەو پیاوە کێ‌یە ؟

— کوڕم پێم‌وتی باوکتە •• باوکت •• ئیتر بڕایەوە •• بڕوا بە
دایكی خۆت ناکەیت ؟!

— باوکم ؟ باوك کەی وایە ؟! توخوا دایە بەراستی پێم‌بڵێ باوك
چی‌یە ؟!

کسپە لە ناخت هەستا •• ناچار بوویت بەپێچەوانەی جارانەوە
وەڵامی بدەیتەوە ••

— ڕۆڵە •• هەموو کەسێ باوکی هەیە •• ئەم پیاوەش باوکی تۆیە••
باوك ئاوایەو بڕایەوە ••

ئاسۆ بە فرکانێ لە باوەشت دەرپەڕی •• هەستت‌کرد ئەو وتانە
باوکی ئاسۆیان بریندار کرد •• چاوت بڕی‌یە مێردەکەت •• ئاسۆ
چەشنی مقەست دەزوولەی نێوان چاوتانی قرتاند :

— وەڵڵاهی درۆ دەکەیت ••

باوك سەری داخست •• وای هەست‌دەکرد بە ژن‌و کوڕەکەی
بێگانەیە •• تۆش هەوڵت‌دەدا شتەکان بەئاسایی دەرخەیت‌و بە هێمنی لە
شێوەی ئەکتەرێکی بەتوانادا خۆت زیزکردو ڕووت لە ئاسۆ کرد :

— به دایکی خۆت وت درۆده‌کەیت ؟ بڕۆ ئیتر کوڕی من مەبە ••
به‌گورجی گه‌ڕایه‌وه باوه‌شت‌و ده‌ستی‌کرده ملت •
— ئاخر دایه گیان •• ئەی بەفرەکە کوانێ •• ئەی ڕەشەبا کوا ؟
— بڕۆ •• بەعز ••

دەستە بچکۆلەکانی ئاسۆ توندتر لە گەردنت ئالآن‌و هەستت بە پشوودانێکی دایکانەی خۆش کرد ••

— ئەی لە ژوورەکەی ئەولا •• هەمووشەوێ باسی باوکمت بۆ نەدەکردم ؟! خۆت نەت‌وت ئێستا باوکت توندو تۆڵ خۆی پێچاوەتەوە •• لەسەر لووتکەی چیاوە بەرەو شار دێت •• بەفریش وەك پارچە لۆکەی پاك‌و بێگەرد بەسەریا پرووشە دەکات‌و بەسەر شان‌و مل‌و سەریەوە دەگیرسێتەوە ؟! توخوا دایە بەفر چۆنە ؟ ئەی کوا خۆ هیچی پێوە نەماوە •• دە پیشانم بدە •• تۆ نەت‌وت دوایی هەموو شتێکت نیشان دەدەم ؟

بە سۆزی گەرمی دایکانەوە ئاسۆت بە دڵتەوە نووساند • تیلەی سەرنجت گرتە باوکی ئاسۆ •• ئەو دەمێ بوو هەست‌و هۆشی فڕی‌بوو•• چاوی بڕی‌بووە بۆشایی •• [ شەوانی ساردو سەخت •• مەرگبازی •• هاشاوڵی ڕەوە گورگ بۆ سەریان • هاشاوڵی ئەوان بۆسەر ڕەوە گورگ •• لاکی گورگی تۆپیو لەنێو بەفرا •• کەڵبەی تیژی گورگی لە لاشە گیر بوو ••• ]

— دایە •• دە پێم‌بڵێ •• ئەی باجی پیرۆز نەی‌وت باوکت ڕەشەبایە •• لە تاریکی شەودا خۆی بە شاردا دەکات ؟! گەڵای سیس‌و زەردی درەختەکان ئەوەرێنێ •• شار دەشڵەژێ •• وتی: ڕەنگە لەپڕیکا خۆی بێرەش‌دا بکات‌و چاوی ئەوانە کوێر بکات

کە هەموو ڕۆژێ دێن‌و دەمانژمێرن ••• یێک ••• دوو ••• سێ •••• حەوت • ئەوجارەیان لە منەوە دەستی‌پێ‌کردە•• من یێکەمین بووم • ئەوجارەشیان خۆم شاردەوە ••• حەوتەمین بووم •• چاویان لێم زەق‌کردەوە •• ئەگەر ڕەشەباکە بهاتایە یێکسەر دەچووە چاویانەوە •• کوێری دەکردن •• ئەمجا هەموومانی دەگرتە باوەش‌و ماچی دەکردین‌و لەگەڵ خۆی دەیبردینە دەرەوە •• بۆ نێو •• نێو •• بۆ کوێ دایە ؟

— بۆ دەرەوە •

— نا •• باجی پیرۆز دەیوت بۆ نێو ••• بۆ نێو ••• شەقام‌و کۆڵانەکان •• دایە توخوا شەقام‌و کۆڵان چی‌یە ؟!

— شەقام ئەوەیە ئوتومبیلی پیا دەڕوات‌و کۆلانیش ئەوەیە لە بەیانی‌یەوە تائێستا یاریی تیا دەکەیت ••

— من زۆر لە ئوتومبیل دەترسم •• ئوتومبیل چۆن دەڕوات ؟! خەڵکی ناترسن سواری ئوتومبیل دەبن ؟!

کۆمەڵێ دیمەنی پڕ لە ناسۆر یا لە شێوەی بروسکەدا یا زۆر زۆر خاو بە بەرچاوتا تێپەڕین :

[ گێرمەو کێشەو پەل ڕاکێشان‌و قیژەو هاوار •• دوان دەست ئەدەنە باڵت‌و بۆسەر ئوتومبیلەکە سەرت‌دەخەن •• بەئەنقەست دەست‌و ئانیشك لە مەمك‌و سکە بەرزبووەکەت دەخەن •• پوورە تەنکەو باجی پیرۆزو سێ منداڵی‌تریش بەدواتا سەردەخەن •• مانگ‌و نیوێك‌و •• ئازارو بەرەژان‌و ژان ••

— بێگەرد •• باوانەکەم •• پشت‌بەخوا هەر ئێستاکە ڕزگارت

دەبێت •• دان بە خۆتا بگرە •• با پێمان‌نەزانن خوا دەیزانێ دوایی
چیت بەسەردێنن‌و منداڵەکەشت چی لێ دەکەن :

— پووری گیان •• خۆزگە بەسەر ئەم سکەوە دەچووم‌و بەئیجگاری
ڕزگارم دەبوو ••

— وا مەڵێ کیژەکەم •• دنیا هەروا نابێت •• نەت‌بیستووە دەڵێن :
ئەو منداڵەی لە تاریکایی‌و تەنگانەدا لەدایك دەبێ •• دنیا پڕ لە
ڕووناکی‌و فەرەحی دەکات •• غیرەتت بێ کچم ••

سێ منداڵ بەترسەوە سەیری دیمەنی سامناکی منداڵ بوونت
دەکەن •• لێوت دەگەزی •• چمکی کراس‌و کەوای پووره تەنکەو
پیرۆز لە مستت‌دا لوول‌دەدەی •• ئارەقی ڕەش‌و شین‌و ••••]

— دایە گیان ئەها دەستم •• کام پەنجەت دەوێ •• با ئاشت بینەوە ••

ئاسۆی هاوڕێی شەوو ڕۆژت هەموو دەمێ خەم‌ڕەوێن‌و
سەبووی‌دەرت بوو • ئەمە دووڕۆژە هێند پرسیارت لێ‌دەکات خەریکە
بێزار بیت ••

[ ناهەقی نی‌یە •• هیچی نەدیوە •• تەنیا قفڵ‌و پەنجەرەی
بێ‌شووشە ، دیوار ، سەموون‌و چا ، سەعات ، پۆلیس ، شۆربا ••
چەك •• زەنگیانە •• کەمێکیش خۆرو هەتاوو ئاسمان •••]

— کوڕەکەم •• زۆر بێ‌تاقەت‌و حەوسەڵەم •• هەرچی پرسیارێکت
هەیە هەڵی‌گرە بۆ دوایی ••

— دوایی کەی ؟ تۆ نەت‌وت باوکمان ئەمانبات بۆ نێو باخ‌و دەرختی
زۆرمان نیشان‌دەدات •• ئەمانبات بۆ سەر شاخ‌و نێو دۆڵ ••

توخوا دایە گیان •• هەر پێم بڵێ شاخ چی‌یەو هیچی‌تر •• ئیتر پرسیاری‌تر ناکەم •

بە بێ‌ئاوڕدانەوە لە ئاسۆ •• بە بێزاری‌یەوە سەیرێکی مێردەکەت کرد :

— شاخ هیچ نی‌یە •

ئاسۆ فڕکەی کردەوەو لای دەرگاکە لاتریسکەی بەست :

— ساوەڵڵا پێم‌نەڵێیت شاخ چی‌یە نایەمە ژوورەوە • لەمە زیاتر خۆت پێ‌نەگیرا •• تیلەبێکی پڕ لە گلەییت گرتە باوکی ئاسۆو بانگی ئاسۆت‌کرد :

— بڕۆ لای باوکت •• با پێت‌بڵێ شاخ چی‌یە •

ئاسۆ وای‌زانی گاڵتەی لەگەڵا دەکەیت‌و بە زەردەخەنەوە :

— جا چۆن بەتەنیا بچم بۆ لای باوکم؟ من چوزانم ئێستاکە لەکوێ‌یە•• چۆنی بدۆزمەوە ؟!

مێردەکەت سەری بەرزکردەوەو کەمێ ماتی‌و تووڕەیی لە نێوچاوانیا دیاربوو :

— وەرە ئاسۆ •• وەرە باوکەکەم •• من پێت‌بڵێم •

بە قورسی‌یەکەوە لەجێی خۆی ڕاست‌بۆوەو پەلی ئاسۆی گرت‌و دەرگای دەرەوەی داخست‌و هێنایە نزیکی‌یەوە :

— کوڕەکەم •• وەك دایکت وتی : شاخ هیچ نی‌یە •

هەرگیز ئەم وەڵامەت لە باوکی ئاسۆ چاوەڕوان نەدەکرد •

[ کار وا بڕوا هەموو ڕەنجێکم بەبادەچێ •• ئاسۆ سەرەڕای ئەوەی هەموو دەروازەکانی ژیانی لەسەر داخرابوو کەچی هەرچی شت هەیە دەیزانێ‌و فێرمان کردووە•• بەڵام هیچیانی نەدیوە •• دەرخت ••

قەڵەم •• ئەسـپ •• کۆتر •• ڕەسـم •• تەلەفـزیـۆن •• ڕادیۆ ••
سەلاجە • • شووتی • • ترێ • • ڕووبار • • گوڵ • • چیمەن ••
بێشکە •• مۆسیقا •• گۆشتی برژاو •• کتێب ••• نا •• نابێ وابێ ••
دەبێ ئەو منداڵەی لە تاریـکیدا دێتە دنیـاوە •• دنیا پـڕ لـە ڕووناکی
بکات •• ]

به زەردەخەنەیێکی دایکانەوە ئاسۆت هێنایە لای خۆتەوە :

— ئاسۆ •• بەڕاستە نازانیت شاخ چی‌یە ؟
قریوەیێکی کردو بە دەست لە هەوادا وێنەی کێشا •
— ئە ئاوا •• لێرەوە •• ئەمە ئەرزە •• بەرزدەبێتەوە •• بـەرز
دەبێتەوە •• بۆ سەرەوە •• بۆ سـەرەوە ••

هەستایە سـەر پێو هـەتا دەسـتی بڕبکات بـەرزی کـردەوە :
بۆسەرەوە •• تا ئاسمان •• هیچ شتێ لە شاخ بەرزتر نی‌یە • هەمـوو
شتێ لەوێوە دیـارە •• ئەی بووڕێ فێری نـەکردم ؟ • شـاخ دەرگای
نی‌یە •• پەنجەرەی نی‌یە •• دیواری نی‌یە •• کلیل‌و قفڵی نی‌یە •••
باوکی هەموو کەسێك لەوێ‌یە •• توخوا وانی‌یە دایە ؟ !

مێردەکەت بە شێوەیێك دەیڕوانی‌یە هەردوکتان وەك ئەوە وابـێ
منەتتان بەسەرا بکات‌و ناڕازی بێ لێتان •• تۆش وات هەست‌کرد لەتەك
ئاسۆدا پێکەوە یێك مرۆڤن‌و هیچ پێوەندی‌یەکتان بەوی بەرامبەرتانەوە
نەماوە •• گەرچی دوێنێ پێی ووتیت : « لەبـەر خاتـری تۆو ئاسۆی
کوڕم وام بە خۆم کرد » ئەوەتا ئێستاکەش لێوی هەڵهێنایەوە :

— بێگەرد •• دەبێ هەموو شتێ لەبیر خۆت‌و ئاسۆ بەریتەوە •• بەشی
خۆمـان بـەزیادەوە کرد • ئیتر کاتـی ئـەوە هاتـووە ئێمەش
وەك هەزارانی‌تر پێکەوە بە ئاسوودەگی بژین‌و بحەسێینـەوە ••

سەیرکە ئێستاکە سەد قاتی جاران وەزعو گوزەرانمان باشـــەو
تا بێ باشتریش دەبێت •

وشەکانی لەبەرچاوتا بوونە تەختەسرو لاستیکی خەتکوژاندنەوە ••
دەیانویست چوار ساڵو نیوی ئازارو بەرگەگرتنو ئاواتتان بکوژێننەوەو
بیکەنە پەڵەیێکی خۆڵەمێشی بە ڕووتانەوە •• مێردەکەت لە بـەرچاوت
بووە یاساولێکی چاوزەقو خەریکە سەرژمێرتان دەکات •• ئاسۆ •• یێك
تۆ •• دوو •• یێکسەر پوورە تەنکەو باجـی پـیرۆزو ئـازادو نەوزادو
شێرزاد •• حەوت •• زۆری‌تریش هەر دەهاتـنو دەبوونـە یێك ••
ژوورەکەتان پڕ بوو •• جێگە نەما •• لەسەر یێك •• لەژێر یێك • •
حەوشە •• سەربان •• بن‌بان •• تەنگتان بە مێردەکەت هەڵچـنی • •
خەریك‌بوو لە کراسەکەت بێتـەدەرێ •• وات دەزانـی •• بەرەژانو
ژان دەتگرێتەوە •• هەمووتان پێکەوەنو تازە ئاسۆ لەدایك‌دەبێتەوە ••
تەنیا پیاوێکی نامۆتان لە ناودایە •• نامەحرەمەو نابـێ چاوی لە منـداڵ
بوونت بێ •• نابێ سەیربکات •• [ کیژەکەم دان بەخۆتا بگرە •• بـا
پێمان نەزانن •• خوا دەیزانێ دوایی کۆرپەکەت چی‌لێ‌دەکەن •• ]

ئاسۆت گرت بەسنـگتەوە •• مێردەکـەت هەستاو دەستی دایـــە
پێلاوەکانی •• هەناسەیێکی گەرمت هەڵکیشاو ڕووت‌کردە ئاسۆ ••

— ڕۆڵە •• درۆم لەگەڵا کردیت •• ئەو پیاوە باوکت نی‌یە •• باوکت
نی‌یە •• باوکت هەر لە شوێنی خۆیەتی •• دوایی دەتبەم • •
هەموو شتێکت نیشان‌دەدەم •• هەمـوو شـتە ڕاستەقینـەکان • •
شاخ •• ڕوبار •• بەفر •• ڕەشەبا •• نیشـتمان •• خـوا ••
سەربەستی •••

**ئابی ١٩٨٢**

# چــوار پارچــه هۆنراوه

ع٠ ح٠ ب

١ـ بەردە قارەمان

لە ملەی بازیان
لەسەر چەقی ڕێ
لە شوێنێکی نەرمو نیان
تلەبەردێ
ئەوەندەی زووڕێ گەورە
بۆ خەڵکی ئەم دەورە
نموونەی ئازایەتی بوو
هی کەسایەتی بوو
بەردە قارەمان
بۆ خەباتی دارە دارەمان
چرا بوو
دەستەبــرا بوو
ئەو ڕۆژەی لە بازیان
لێڵ بوو وەك ئەمڕۆ ژیان
لەگەڵ ئەوانەی چەقۆیان لێ ئەسووین
دەستەویەخە بووین

ئەورۆژە بەردە قارەمان
یاریدەدەر بوو
سوپـەر بوو
لەڕاستی
دوژمن پاراستی
بەردە قارەمان
کە لای خەڵکی ئەم شارەمان
خۆشەویست بوو وەك جگەری پارەمان
ئەویش وەك ئینسان
کەوتە بەر قەپی کەڵبەو دان
زنجیری لە مل نرا
ریشەکێش کرا .

## ٢ـ فـەرمان

بۆ لێدانی تەپڵی جەنگ
دوێنێ زوو بوو سبەی درەنگ
ئێستە
راپەڕین پڕبەپێستە
سەردارێکی مەزن
بۆ پەلاماردانی دوژمن
فەرمانی
وا دەرکرد بۆ هاوڕێکانی
چەوساوەی هەزار ساڵ
ژیان ئاڵۆزو تاڵ

ووردو درشت
مشت لەناو مشت
بەپیر دەنگەوە چوون
شەوەزەنگیان کرد بە ڕۆژی ڕوون
بەدرێژایی هەزاران هەزار
ساڵ بۆ یەکەمجار
لە جەنگێکا ستەم دۆڕا
هەرچی شتە شێوەی گۆڕا
قەڵای هەرە زۆردار
تەختکراو سەرەوخوار
قەیسەر
بێپشتیوانو یاریدەدەر
کراسی بەزینی لەبەرا
شار بەدەرکرا
فەرمانڕەوایی
کەوتە دەست مرۆی ئاسایی
ژیانی یەکسانی
کۆتایی بە هەموو جەورێ هانی
چەوساوەکانی دوێ
بوونە خاوەنی ژینی نوێ

٣ــ گەورەکان

هەندێ گەورە
لەوانەی شوێنیان زوور هەورە

بگرەو بەردەیان بەدەستە
تەنیا هەر خۆیان مەبەستە
هەردەم خەریکی درۆینەن
لە دزیو هەڵپەدا بێوێنەن
ئەوانەی وا
خۆیان ئەبەنە ریزی خوا
چاو لە چەوساوەکان مۆڕن
ئێستا ئەوانە وەك چەقەڵ
تاك تاكو کۆمەڵ کۆمەڵ
بەری رەنجیان ئەچننەوە
ئەچنە ریزی دوژمنەوە
بەڵام ئەوەی جێی داخە خەڵك
لە ڕابوردوو وەرناگرێ کەڵك
ئێستەش کە لەگەڵ یەکدا ئەدوێن
بە گەورە پیاویان دائەنێن

٤ـ بۆ دەوڵەمەندەکان

ئەی خاوەن پارەی بێشومار
بیخە سەر یەك پارە بە بار
لێدە لە چەپڵەو هەڵپەڕە
مژدەت لێ بێ ئەوا شەڕە
شەڕ شەڕی ئێوەی سووخۆرە
ئێوەی پارەو سامان زۆرە
ئێوە کە هەزار کاسەی سەر

هەزاران لاوی پڕ هونەر
بە هەزاران مزگەوتو شار
نادەن بە تاقە یەك دینار
دەی هەڵبەڕن
وەك سەگ شەوو ڕۆژ بوەڕن
لێوانکەن وورگی ئارەزوو
لەسەر لاشەی لانەی تێکچوو
بەڵام دەوڵەمەندەکانی کورد !
لێیان روونە درشتو وورد
کە چی ئەکەنو چیتان کرد
ئەزانن نەوەی کاوەی کورد
دەستتان بۆهەر پاروویە برد
خوێنی کەسێکە ئێستا مرد

---

لقی یەکێتیی نووسەرانی کورد لە سلێمانی ئەرکی
لەچاپدانی ئەم ژمارەیەی لەئەستۆ گرتووە ٠

---

# ڕیپۆرتاژی تانگانیکـا
# له ۱۰ نامەدا

شیعری :
ناظم حیکمەت
شـوکور مسـتەفا
کردوویه بە کوردی

## نامەی یەکەم

بە دەشتە بەفرگرتووەکانی ئۆکرایینادا دەفڕم •
چەندین ساڵە ، ئەمە یەکەم گەشتی ئاسمانیمە بێ تۆ •
لە دەستت گەڕام کە لە زەوی دابڕام ،
ڕاهاتنـە ،
کە دەشنیشمەوە هەر دەگەڕێم •
دوێشەو باوڵەکەم دەپێچایەوە ،
سەرشانەکانت خەمبار بوون ،
بەڵکو واش نەبێ ، من پێموابوو ، چونکە حەز لە خەمباربوونیان دەکەم •
ئەم بەیانی‌یە لەگەڵ ڕووناکیی بەفردا بەخەبەرهاتم •
مۆسکۆ لە خرپەی خەودا بوو ، تۆیش لە خرپەی خەودا بووی •
قژت لە ڕەنگی کا ، بژانگت شین •
گەردنە سپی‌یەکەت درێژ بوو ، خڕ بوو ،
لێوە سوورە گۆشتنەکەت بە بارێ خەمەوە •

ڕەنگە واش نەبێ ، من پێم‌وابوو ، چونکە حەز لە خەمباربوونی دەکەم •
بەسەر نووکی پەنجەوە دامکێشایە نێو ژوورەکەی لاتەنیشتەوە •
وێنەکەت لەسەر مێزەکەم بوو ، سەیری خۆرەتاوێکی هاوینانت دەکرد ،
لە لاڕا وێنەکەت گیرابوو •
بەتەنگ ڕۆیشتنمەوە نیت •
ئاخنیمە گیرفانمەوە •
دنیا تەواو ڕوون بۆوە •
تابلۆیەکی بۆیەی چەوری دینۆ بە دیوارەوە :
گەواڵۆکەیێ هەور بە ڕووی ئاسمانێکی بێ‌سنوورەوە ،
ڕەنگە نە ڕووی ئاسمان ، نە هەور ،
بزاوتۆکەیێکی سپی لە شینایی‌یەکی بێ‌سنوورەوە ،
نیگاری گەشبینی ، بەختەوەری •
ژنە دەرکەوانەکان لە حەوشە کرەکرِ دەستیان بە بەفرماڵین کرد •
چوومە ژوورەوە •
لە سەرو سوورەتم ڕاماوی ، پەشێو ، خەمناك ،
ڕەنگە خەم نەبێ ، چاو خەواڵوویی بێ ،
گوتم : « بۆ بەڕێ‌کردنم مەیێ » ،
کەچی هەر وەخت بوو بۆ بەڕێ‌کردنم سوێم‌بێتەوە ، تۆ نازانی •
باوڵەکەمت بە دەستی خۆت کلیل‌دا •
دەرکەم کردەوە چوومە نێو داڵانەکە •
تۆ لە ژووری لەگەڵ دەرکەدا دیمەنی بەهاری بووی ، دیمەنی بەهارێ
لە گەرمەی چێشتاندا ، گەڵاو ئاونگ یەك پارچە بریق‌وباق •
بێ‌سێبەر •
دەرکەم لەسەر پێوەدای •

تا گەیشتینە ڤۆنۆکۆڤا ، دووبەدوو لەگەڵ ( ئەکبەر ) هەر لە بارتۆوە دووایین ،
ڕاستت دەوێ هەر من قسەم دەکرد ، ئەو گوێگر بوو •
وا بەسەر دەریای ڕەشدا دەفڕم ، لە بڵیندیی هەشت هەزار مەترەوە •
نازانم لەبیرت دێ ،
ئەوە بوو بە ساڵــێ ،
پێکەوە بەسەر وارشۆ ـ ڕۆما ـ پاریسدا بۆ قاهیرە فڕیین •
تۆ بڵێی قاهیرە هەر ئەو قاهیرەکەی جاران بێ بێ تۆ ؟
لە بڵیندایی هەشت هەزار مەترەوە ، وام بەسەر ئەنەدۆڵەکەمەوە •
لە قووڵایی هەشت هەزار مەتـردا ، لەژێـر هـەورەوە ، وڵاتـەکەم زستانی ڕەش •
گوندەکان لەمێژە ڕێیان بڕاوە ، ڕێبەندانە •
هەریەکە بە تاقی تەنیا لە چۆڵێکی بەفرگرتوودا •
شۆربای ساوار بە بێچەوری •
لەبەر چەقو دووکەڵی تەپاڵە چاو چاو نابینێ •
ساوا هێند زوو دەمرن ، وەختێ ئەسپێو ڕشك تێدانیان وەچەنگ ناکەوێ •
کەچی منیش لە بەرزایی هەشت هەزار مەترەوە ، لە سەرووی هەورەوە دەفڕم •
بەڵێ ئاوها تولیاکۆڤا •••

## نامەی دووەم

لە قاهیرە باخچەی ئوزبەگی یەت لەبیرە ؟
چووم ئەو ڕیزەی لێی دانیشتین دیتمەوە •
لاقی شەلەیان هێشتا نەگرتووەتەوە •
شەو بوو ، بەبیرت دێ ؟

دنیا تێکەڵو پێکەڵ ،
ئەستێرە ، چراو چراخانی ئۆتومبێل ، جامخانەی موغازەکان .
دەرۆزەکەرە دیزداشە درێژ لەبەرەکە .
لە ژنە خەمبارەکە دووایین لە بیرتە ؟
دەمو چاوی لە نیڤەرتیتی قرالیچە دەچوو .
مێردە کۆمۆنیستەکەی پێنج ساڵە لە گیانەلادایە ،
لە ناوەندی چۆڵێ ، لە وارگەیێکی بەند داکردن .

لە قاهیرە باخچەی ئوزبەگی‌یەت لەبیرە ؟
چووم ئەو ڕیزەی لێی دانیشتین دیتمەوە .
لاقی شەلەیان هێشتا نەگرتووەتەوە .
دارو درەخت بەم ڕۆژگارە هەروا تۆزاوین .
دەرۆزەکەرە دیزداشە درێژ لەبەرەکە بەجارێ وشكو ڕەق هەڵاتووە .
مێردی ژنە خەمبارەکەیش بۆ خۆی مردووە .
لە قاهیرە باخچەی ئوزبەگی‌یەت لەبیرە ؟

## نامەی سێیەم

شەوێ ، درەنگێ ، لە قاهیرەوە فڕین
لە دوور چرای سووری لێكدابڕان بەسەر نووکی باڵەکەوە دەسووتا .
توند توند دەستم بە ئەستێرەکانەوە گرت ، لێی نووستم .
لەگەڵ چاوڕۆشنانی بەیاندا لە فڕۆکەخانەی خورتووم نیشتینەوە ،
چاوڕۆشنانێکی سپی ، بێ‌هەورو هەڵا ،
چاوڕۆشنانێکی وەك جوڕی شیر ،
وەك کاژە فنجانی تەنك .

ــــ فڕۆکەخانەی سوودان « کۆمێت »ێکی لێبوو هێندەی دێوێ •
فڕوکەیێکی وەرزشوانیی لێبوو زەرد، سوور، چکۆلەو خنجیلانە•
ــــ ئەوە چیبوو هیچی لێ حاڵی نەبووم •

فڕۆکەخانەی خورتووم پاکو خاوێن •
ڕۆژ فێنك فێنك بەرزدەبۆوە •
بەرانبەری لێی دانیشتم ، پاڵتۆیەکەم لەشانکرد •
لە هەرکوێ بم ،
تەنانەت لە زیندانیشدا
ڕۆژگارم بە موژدە بەگوێچرپاندنەوە دەستپێدەکا •

سوودانییەکان جوانن •
ــــ ژنە سوودانییەکی شاعیر دەناسم ، شای جوانانە ــ ،
لەسەر داری هەرە ڕەسەنی ئەبەنۆس هەڵکەندراون •

بە کراسی سپییەوە ، بە سەرپۆشی سپییەوە ، بە مێزەری سپییەوە •
ئەفسەری سوودانی دێنو دەچن ، بە ئینگلیزی قسەدەکەن ،
نێچیروانە سوورە چاوکاڵەکان وێسکییان دەخواردەوە •
نێچیروانەکان بۆ ڕاوە شێر هاتوون •
وە بۆ ڕاوە لۆکەیش •

تفەنگەکانیان کیفیان نایلۆنە •
ڕۆژ ڕمبێ بەرزبۆوە •
پاڵتۆیەکەم فڕێدا ، چاکەتەکەم دەرێنا •
« کۆمێت »ی تایین وەك ئاورپژێن گرماندی ،
فڕی بەرەو لۆندەرە •

تۆ لەکوێ بزانی کچم ،
عوسمانی‌یەکانی منیش لەم خاکە سوورە کۆیلەفروشی‌یان دەکرد •
کۆیلەکان بەژنیان دوو مەتر ،
دانی فیل ، زێڕ ،
باج و سەرانەیان خڕدەکردەوە ، ژنان ، لە دەرلنگی دەرپێوە پشیلەیان
تێ‌بەردەدان •
ئەم دەستوورە ڕەنگە ئێستاکەیش هەر باو بێ لە ئەنەدۆڵ •
بەڵام کۆیلەکانی ئەنەدۆڵ کورتەبنەو ڕەقەڵەن •

## نامەی چواردم

ڕەنگە باڵدار لە ئەستەمووڵەوە ، لە مۆسکۆوە بێن بۆ داروسسەلام •
باڵدار لەکوێ‌وە بۆکوێ ناچن •
بەڵام یەکەم فڕۆکەی موسکۆیی تائێستا بە چڵی ئـەم خاکەوە نیشتبێتـەوە
هێنەکەی ئێمەیە
یەکەم ئەستەمووڵیش منم •
بۆنی ئافریقام بەر لووت کەوت ،
بۆنی ئافریقای گەورە ، ئافریقای ڕەش :
بۆنی دارو درەختی زل ، زیندەوەری زل ، خۆری زل ، بارانی زل ،
ئەستێرەی زلی لێ دێ •
بەناو دار خورماو دار مۆزدا چووینە ناو شارەوە •
ئینجا چووینە ناو ماڵە شووشەیەکەوە(١) ، ئەوەندی چاو بگرێ سەوز ،
ئەوەندی چاوبگرێ گەرم •

---

(١) مەبەست لە ماڵە شووشە : ئەو شوێنانەیە کە بۆ ماسی بەخێوکردن و نموونە شەتڵە درەخت دروست دەکرێن •

لە ڕۆژاوای داروسسەلام ، لە ئۆقیانووسی هیند ،
بەر لە موحەممەد عـەرەبە بازرگانـەکان لەگـەڵ قورسانـە عەرەبـــە
برۆڕەشەکاندا گەیشتنە ئەم کەناراوانە •

لەپاشان قورسانی‌تر لەگەڵ قورسانی‌تردا •
ئەمانە برۆیان خورمایی بوو •
بەڵام مەسەلەکە کاری بە برۆوە نیە •
پێتەختی تانگانیکا داروسسەلام •
تانگانیکا •
تانگانیکا ، تانگانیکا •
هۆرەیەك بەم ڕەنگە دەتوانێ دەست‌پێ‌بکا
لەسەر هەوای تەم‌تەم :
تانگانیکا ، تانگانیـکا •••
لە خەمباری ، لە دڵشادی ، لە ژیری ، لە شێتی ، لە سەوزی ،
لە سووری ، لە زەردی ، لە ڕەشبۆری ، لە ڕەشی •
تانگانیکا ، تانگانیـکا •••
دەزانـی ،
تانگانیکای باشووری ڕۆژهەڵاتی ئافریقا ،
١٠ ملیۆن ئینسانی تێدا دەژی لە ١٢٠ هۆز •
لە موسوڵمان ، لە عیسایی ، لە بتپەرست •
دەزانـی ،
ئیرووی سەرەکیی : قاوە ، پەز ، گوشە •
گەڵاگوش شمشێرێکی ڕووتی سەوزە •
شریت‌و گوریس‌و جڕوجەواڵی لێ سازدەکرێ •

دەزانی ،
ئەمانەم هیچیان بەر لەم گەشتەم نەدەزانی .
گەشتەکەت بەبیردێ پێکەوە لە هارتا کردمان .
کەشتی یەکەمان سێ ستوونی بوو ، سەری کەوانی .
وێنەی کچە زێڕەکەی بەپێشەوەی کەشتی یەکەوەیە لە خۆت دەچێ .
لەبیرتە شیعرەکانم لەسەر ئالاکەی بوو نووسیت ؟
وە ڕاوە ماسیمان کرد ، هەموو چاو زومڕووت چاو زومڕووت .
باڵدار بە ستوونەکانەوە نیشتبوونەوە، شاپەڕ سوورمەیی، شاپەر سورمەیی .
لەگوێ دەریاکانەوە مەیموون مۆزبارانیان کردین .
بە پشتەبا لە دەریا گەرمەسێرەکانەوە تێپەڕین .
هەروەها وەرسووڕاینەوە بە هەزارحاڵ لــە تۆڕی دایــەرە قوتبی یــەکان
ڕزگاربووین .
تا داروسسەلاممان
دۆزییەوە .
گەشتەکەت بەبیردێ لە هارتا پێکەوە کردمان ؟
لە داروسسەلام لەگەڵ سەربازە کەسنەناسە تانگانیکایی یەکەدا قسەم کرد .
لەبرنجەدارێژرابوو ، لە هێرش بردندا ،
بەسەر لاقە باریكو ڕووتەکانیەوە ڕاوەستابوو چەكبەدەست .
بولوارێکی لەپشتەوە ، بەرانبەر بە شۆسەکە ، جامخانەی موغازەکان .
لای ڕاستی بینای بانقێ ، لای چەپی کلێسەیەك .
ـــ گوتم هێرش بۆسەر کێ دەبەی ؟ ـــ
ـــ گوتی بۆ ئەڵەمان .
گوتی هی ئەڵەمان بووین ، تا شەڕی یەکەمی جیهان .

ئینگلیز هاتن ، کۆمیتەیان گرت ، لە ئەڵەمان ڕۆهاتین •
ئەڵەمان ڕۆیشت ، ئینگلیز مایەوە •
ئینگلیز لە ١٨وە تا ٦٢ مایەوە •
لە ٦٢دا پاڵمان بە ئینگلیزەوە نا ،
گوتی ، کۆماری سەربەخۆین
هەر هێندەی گوت و بڕییەوە •

داروسسەلام شارۆکەیێکی دڵگیرە
شارێ و شەقامەکانی پاک و خاوێنن ، بە تەعمیرات و ئاوەدان و خۆشن •
گەڕەکێکی گەورەی خۆشی هیندییەکانی لێیە •
هێندییەکان بێ بەزە سەرگەرمی بازرگانین •
بۆیان بکرێ ئاوی ئۆقیانووسەکانیش بە شووشە دەفرۆشن •
تانگانیکایی دژمنی سەری هیندییە بازرگانەکانن •
یانەیێکی ئینگلیزەکان لەنێو شاردایە •
وەختی خۆی هەر بۆ سپییەکان بوو •
ئێستا ناوەکەی گۆڕاوە ، هاتوچۆکەرانیشی •
کۆشک و سەرای سەرکۆمار •
وەختی خۆی والی ئینگلیزی تێدابوو •
کۆلێجێکیش ، ٤٨ قوتابی هەیە ، هەموو تانگانیکایی •
پرۆفیسۆرەکان ئینگلیزن •
کڵێسە ، مزگەوت ، ڤیللا ، ئوتێل ، باڵیۆزخانە ،
باڵیۆزخانەی سوڤێت لە خانووی موسوڵمانێکدایە •
دەرگاکەی بیسمللایەکی بە ئەلفبێتکەی عەرەبی لێنووسراوە •

تراموای و پاس و فلانی نیە ،

بەڵام لە هەر مارکەیەکت ئوتومبیل دەوێ هەیە •
هەمووشیان سوکانەکانیان لای دەستەڕاستەوەن •
سیستێمی ئینگلیزە •
شووفێری تانگانیکایی فرە وەستان •
کابارێیشی لێیە تا بەیانی دەروەتاك •
تانگانیکایی‌یەکان ، خەڵکی ولاتەکە
لە زنجو کولبەی قەمیش‌و ژاژدا لەسەر زەوی دەژین •
زمانی دەولەت بە سەواحیلی‌و ئینگلیزی‌یە •
ئەندازیاری تانگانیکایی لە سەرانسەری تانگانیکادا
(١) دانەیە •

٣ پزیشك

سەرخۆشی تانگانیکاییم نەدیت •
سەرخۆشەکان لە سپی‌یەکانن •
سپیی بێ‌کارم نەدیت •
بێ‌کار هەموو تانگانیکایین •
ئەوانەی لەسەر شۆسەکان شیرەدارینە بە توریستان دەفرۆشن
تانگانیکایین •

ئەفسەری تانگانیکاییم دیت ، سەرکۆمارم دیت ، مامۆستام دیت •
سەرکۆمار نایرێری بێ‌وچان بە چاوی مامۆستایەکی خەیاڵ بردووەوە لە
دیوارەکانەوە سەیر دەکا •

لەنێو چوارچێوەکەیدا ، لەژێر جامێکەوە دانیشتووە ، خۆی بەسەر
باستۆنە سپی‌یەکەیدا داوە •

پۆلیسەکان ، ئەوانە من دیتمن تانگانیکایی بوون •
لە بانقەکاندا کارمەندی تانگانیکاییم نەدیت •

یا سپی یا هیندین •
گارسۆن‌و حەماڵ تانگانیکایین •
گوندی‌یەکانیش ، شوانیش ، کرێکاریش ، سەرەك خێڵ‌و هۆزانیش •
لێروکانەیش فێست لەسەر زۆرن ، ڕەنگاورەنگ ، بابەت بابەت ، بـە
گێزو گوڵینگ ، بێ گێزوگوڵینگ •
ئێمە ، تورك ، فێستمان لە یۆنانی‌یەوە وەرگرتووە ،
لەسەر عەرەبانمان ناوە ،
ڕەنگە لەسەر سوودانی‌یانیش ،
ئەوانیش لەسەر ئافریقایی ڕەش ،
یا ئـەوان ، یا ئینگلیز ،
ئینگلیز لەسەری نابن ،
کەرکەدەنێکی فێس لەسەر ببینم سەرسام نابم •

## نامەی پێنجەم

لە یانەی « سپای ڕزگاری » لە داروسسەلام ، لە گەرمان خەو لە چاوان ناکەوێ •

گەرما فیچق فیچق بەپێستمەوە دەنووسێ •

ژن‌و مێردە کەنەدایی‌یەکان دوعای شێوانیان بە ماگنیتۆفۆن(۲) لەمێژە لێ‌دا•

شێرپ نەڕەیان نایێ •
شێر لە ژوورێن •
شێر ، فیل ، کەرکەدەن ،
زێبرا ، زورافە ، مامز •

---

(۲) ریکۆردەر ، موسەجیلە •

له مۆسکۆ ، له پارکی زۆلۆجـی پڵینـگیش هەیـە ، ورچی سپیـش ، پێنگوینیش •

دۆندرمەی سەرتوێژداریش هەیە •

له مۆسکۆ کولوو کولوو بەفر دەبارێ •

گەرما بەپێستمەوە دەنووسێ

لەژێر پەردەو کولەکەمدا ڕووت‌و قووتم •

سەر پەردەو کولەکەم قومقومۆك تەنیویە •

قومقومۆك له چەشنی بێچوە تیمساح ، زمانیان دەردێنن ،

ڕەنگە قومقومۆکیش نەبن •

له بەندیخانەکـەی بورسـە پەردەو کولەمـان لـە چەرشەفـی نوێنەکان دروست‌کرد ،

سبەینان تەختەکالۆسمان بە مەشکە فڕێ‌دەدا •

گەرما به پێستمەوە دەنووسێ •

گەرما له نەبزمدا پل‌دەدا •

به خوێنی شادەمارەکانمدا دەگەڕێ •

له مۆسکۆ بەفر دەبارێ ،

یانەکو نابارێ ؟

پێش نووستن سەیرێکی تەرمۆمەترەکەت کرد بەتەنیشت پەنجەرەکەوە ؟

١٥ لەژێر سفرەوەیە ، ١٧ لەژێر سفرەوەیە ؟

چرایەکی شین بەسەر سیسەمەکەتەوە •

بیر له چی دەکەیەوە ؟

یاخۆ هەر که سەرت خستە سەر سەرین‌و نەخست ، خەو خەوت لـێ کەوت ؟

له یانەی « سپای ڕزگاری » له داروسسەلام ، خەو له چاوان ناکەوێ •

## نامەی شەشەم

ئەم بەیانی‌یە سەیری ئۆقیانووسی هیندم کرد •
جووتێ قسەم لەگەڵت هەیە دەربارەی ئۆقیانووسەکان •
لە کەناری هەر ئۆقیانووسێکەوە بڕوانی
لەگەڵ مەڕمەڕەدا جیاناکرێتەوە •
ئۆقیانووسەکان لە خۆشەویستی‌یەکی گەورە دەچـن تولیـاکۆڤا
لە سەیرکردن
ئۆقیانووس قنیاتی پێدەکرێ •

## نامەی حەوتەم

کووچەو بازاڕ گەڕام ، ئافرەت !
نرخی شمەکانم یادداشت کرد •
تانگانیکا هەرزانی‌یەکی سەیرە •
مەسەلا ، هەتاو ،
هەرە گەییوەکەی ، هەرە سوورەکەی ،
مەسەلا ، باران ،
لەوانی بە مانگان لێناکاتەوە ، جۆری شەستو ڕەهێڵە •
یا لەرزوتێ ، بابەت بابەت ، هەمەچەشنە •
یا دەستو مەچەکی ئەسمەری تێر ،
لە کاڵ ، لە گەییو •
هەروەها لەوانی کە ناولەپو نینۆکی هەموویان پەمەیی •
تەنانەت مۆز ،
هەر هێشوویەکی پێنج کیلۆیی ،
لە بوتڵێ پیپسی کۆلا هەرزانتر •

ئەمانەم بۆ نووسیت ، هەردوو دیەکەم ، بیردەکەمەوە ،
ئەی ئەنەدۆلەکەی من ، لە تانگانیکا گرانیترە ؟
لە هێندێ جێی ، باران زۆر گرانترە ،
لە هێندێ وەرزدا هەتاو ،
بەڵام نرخی لەرزوتا ،
یاخۆ دەستو مەچەك ،
خۆ یەکجار ، ئەوانی پەنجە بەخەنەکانیان
هیچ لێرە هەرزانتر نین .

ئەگەر مۆز دەڵێی ،
لای ئێمە پێ‌ناگا ،
بەڵام پیوازو خوێ ،
نەك پێنج کیلۆی ، بگرە کیلۆیەکی
بە نرخی مۆزی ئێرەیە .

## نامەی هەشتەم

چۆنی تولیاکۆڤا ، لە چ‌عالەمێکدای ؟
قژە ڕەنگ کاینەکان چۆنن ؟
لە چ‌عالەمێکدان مژۆڵە شینەکان ؟
مژۆڵە شینەکان ڕێم‌بدەن ،
دەمەوێ سەیری ناو چاوەکانتان بکەم ،
بەشکو لە گەڕاندا لەنێو چاوەکانتاندا تووشم بێن ،
بەشکو لەتوێی دێری کتێبێکەوە ،
لە « پێسحچانتایا »ی دووەم ، لە جێ‌سواربوونی پاسدا .

لەنێو چاوەکانتدا تووشم بێن و
بڵێن : « مەرحەبا ناظم ! » چۆنی ، کەیفت سازە ؟ ،
سڵاو لە ڕۆخانەکەی مۆسکۆ دەکەم ،
سڵاو لە مەیدانی سوور ، لە دووکێشی کارگاکان ، سڵاو لە سەربەلەری
شانۆخانەکان دەکەم ،

سڵاو لە وێنەکەی ئەستەموول دەکەم کە بە دیوارەوە هەڵواسراوە !
ئەگەر لە من دەپرسن ، من ئەمە دوو ڕۆژە لە باکوورم
لە ئارووش ، لە مۆشی ،
لە دەوروبەری کوێستانە بەبەفرەکانی کلیمانجارۆم .
کوێستانێکی گەشت و سیاحەتە .
خۆشگوزەرانیی ئوتێلەکان بۆ ئیسویچرایی یەکانە .
مۆشی ، هۆزی جاگگای لێ دەژی .
لە ئوتێلان ، لە مەزرا قاوەکان ،
لە مەزرا گوشەکان کاردەکەن .

مەزرا گوشەکان هی ئینگلیزن ، هی هیندین ،
هی ڕۆمەکانن .

تیرەی جاگگا ڕووخۆش و زیرو نەرمڕەفتارن .
پیاویان بە کراسەوە ، بە شۆرتەوە دەگەڕێن .
بەڵام زۆربەیان حەز لە سواریی پایسکل دەکەن .

ژنانیان بە کراسی ڕەنگاوڕەنگەوە بە لەنجەولار دەڕۆن .
وەك سەرلەبەری ژنانی ئافریقا ، ئەوانیش باری لەخۆزلتر
بەسەر سەریانەوە هەڵدەگرن .

کیژی گەنجو جحێلم دیت •
ڕەش ڕەش وەك بیەری ڕەش ، شیرین وەك شەکرو
بادام ،
بە تەنوورەی فش‌وفۆڵەوە ،
خوێندواری لە ئەنەدۆڵ بەرزتر •

چووم بۆ نگۆرۆنگۆرۆکراتێر •
زارکی ئاورپژێنەکە بە چیمەن‌و دارو درەخت تەنراوە •
گوتیان دووسەت کیلۆمەتر چوارگۆشەیە •
کەرکەدەنی سیاحی‌یانەم دیت
زورافەی سیاحی‌یانە ، فیلی سیاحی‌یانە ،
گەلە گەلە دەگەڕێن ، تۆزدەکەن •

جێبەکەمان بەناویاندا دەڕوا ، نزیك ، هەر لە بن‌لووتیانەوە ،
جارناجارێ سەریان هەڵدەبڕن سەیردەکەن ،
مارکەی ئۆتومبیلەکە دەناسنەوە :
لاندرۆڤەر •

بە خەم‌و نیگەرانی‌یەوە بە ڕاست‌و چەپدا ئاوڕدەدەنەوە ،
وەڕەزی‌یە •
برێ مامز نامۆیی‌یان لە لاندرۆڤەرەکە دەکرد ،
بە گومەتەدایانکێشا •
ئێوارەیەکیان ئامریکایی‌یەك لەو سەر هەرێزە دەبوورێتەوە •
تا سبەینێ شێر لە سەری ئێشك‌دەگرن ،
سەیردەکەن بەهۆش نایەتەوە ،

دەیخۆن •

گۆڕەکەیم دیت •

بەسەرهاتەکەی لە کێلی گۆڕەکەی نووسراوە •

دەوروبەر ( ماسایی ) یەکانی (٣) لێ دەژین ، ڕووتوقووت ،

تەنیا هەر عەیبی ژنان بەدەرەوە نیە •

ئینسانەکان درشتو زەبەللاح •

ئاشقە ڕەنگی قاوەیین •

خۆیان لە ڕەنگی قاوە وەردەدەن •

نەرمەی گوێیان لەسەر شانیان دەخشێ ،

بە شتی قورس شۆڕیدەکەنەوە •

ماسایی‌یەکان ڕەوەندن •

پەزو ڕەشە وڵاخەوانن •

گۆشتی گایەکانیان دەخۆنو شیرەکەی بە گەرمی دەخۆنەوە •

هەر شێرێ هەڵکاتە گاڕانیان ، لە گوێی دەگرن ، بە ڕمبان وەگی دەدڕن•

لە کراتێر چیتان لە هەموو پێ پەسندتر بوو ؟

فیـــل ؟

کەرکەدەن ؟

ماسایی‌یەکان ؟

مامــز ؟

---

(٣) ناوی هۆزێکە •

## نامەی نۆیەم

ڕۆژانی پاش لە زیندان دەرچوونم بەبیردێتەوە ،
نەك لە زیندان دەرکرانم ، لە زیندان دەرچوونم ،
ڕۆژانی لەژوورەوەبوونی خۆم، لەدەرەوەبوونی دۆستانو، بە زۆری(٤)
ڕۆژگار لە زینداندەرچوونم •

شـادی ،
شـایی ، جێژن
کەمێ سەرسام •
شـادی ،
چریسکەی خەونو خەیاڵ ، ئاواتو هەویا بەلقەوە ، نەك بەروبوویان ،
چریسکەیان •
بە دەنگی بەرز مانای زیندان لە هەمووکەسو خۆت گەیاندن تائێستایش
بەدەم زیندان
چوونە خەونەوە ڕادەچنن •

بە یاساو دۆزی ساڵەهای ساڵی زیندانەوە ڕاهاتن بەرۆکت بەرنادا •
زەرفی نامەکانت داناخەی ،
قەرەوانە چاوەڕێ کردن •
لەگەڵ ئێوارە داهات ، دەرکە لەدەرێڕا کلۆمدران ،
چرا لە خۆڕاهەڵایسان •
شـادی ،

(٤) زەغت ، تەوژم • مەبەستی لەزیندان دەرکرانیەتی بـە زۆری ڕای گشتیی جیهان •

شـايی ، جێژن •
بەڵام ڕۆژانی جێژنیش هەروەك هەموو ڕۆژانیتر دووایی‌یان دێ •

سەیرەکەی ماڵەکەت دڵۆپە دەکا ،
پەنجەرەکان ، دەرکەکان چاکردنەوەیان دەوێ ،
ئاوهێنان ، گازکردنەوە ، ئەلەتریك داگیرساندن •
چەرشەف کڕین ، دەفرو ئامان ، کتێب •
دەستو مەچەکت تەیار بۆ کارو فرمان •
ئەوان لە ژوورێش کارو فرمانیان پێ‌کرا ،
بەڵام زانست لەبیرکرا •
پارەشت نیە •
کەوتنە ناو قەرزوقۆڵەیشەوە خەتەرە •
بە چی ، لەکوێوە ، چۆن پێویستە دەست بە بنیـاتنانی ماڵی ئـازادی بکرێ ؟

دەمەوێ بڵێم ،
حاڵی تانگانیکا لە حاڵی تازە لە زیندان دەرچوو دەکا •

**نامەی دەیەم**

گـوێم بـۆ زەوی هەڵخست ،
گـوێم لە خاکی ئافریقا گرت ،
خوتەوبۆڵە دەهات لە ئۆگانداوە ، لە مۆزامبیکەوە ،
لە ئافریقای باشوور پێ پاژنە پەمەیی‌یەکان بەتـووڕەیی‌یـەوە زرە لـە زنجیرەکانیانەوە دێنن •
لێرەوارەکانی ئانگۆلا وەك شێرە سەوزەکانی لە خوێنی خۆدا گەوزیو دەنەڕێنن •

ئیمپریالیزم وەخۆکەوتووە دووا شەڕوگەڕی بەکاردێنێ ،
بەڵام چەکداری ، زیندانەکانی ،
سەر بە والیەکانی •

سەرم هەڵبڕی سەیردەکەم :
ئافریقا لەسەر دووڕیانێ وەستاوە ،
ڕێگا هەیە گرگڕ دەچێتەوە بۆ هەڵدێری کۆیلەیەتی ،
ڕێگا هەیە دەچێتەوە بۆ برایەتیی گەورەی ئازادیی گەورە ••••
واتە دەمەوێ بڵێم ،
هاوسەرۆکە ژیرە شۆخەکەم ،
نامەی نۆیەمم جارێکیتریش بخوێنەوە •
خۆ تۆ بێئەوەی بگوترێ لەب ، لە لەبلەبی دەگەی •
هێندەی ، کە نایزانی ، ئارەزووی چاوپێکەوتنتم هاتووە مۆسکۆییەکەم ،
تولیاکۆڤام !

**ڕەشەمێی ١٩٦٣**
**تانگانیکا**

---

بێ زەخم خەدەنگ مۆژەی مەهرووان
نەنگەن وە سەحرای قیامەت لوان

**مەولەوی**

---

# مریەمو کۆشکو کەلاوە

**شێرزاد حەسەن**

حەسەن •• وەك هەموو ئێوارەیەك •• لەژێر بۆنو باری ئارەقەو بۆیەو چڵكو هەتاوی خۆشی خۆرنشینو نەشئە بەخشی دەمەو ئێواران •• دەگەڕێتەوە••• ئێوارەیەو بەتەنیایە•• تازە لە بۆیەکردنی کوشکێکی نوێ بووەتەوە••• حەسەن دڵدار بووە••• ئێستەش دڵدارە•• پار دڵداری مریەمو شانۆ بووە••• ئەمساڵ•• ئیمڕۆ ئێوارە••• دوای هاوینو پایزو زستانو بەهارێك•• تەنها دڵداری شانۆیە•• مریەم ڕۆیشت•• بەزیندوێتی کۆچی کرد•• پیرە باوکیشی لێ کەوتووە•• دەبێ بە پاسەوانی ئەو کۆشکانەی حەسەن هاوینان بۆیەیان دەکا •• بۆیەی سوورو زەردو شینو سەوزو سپیو قاوەیی •• هەموو ڕەنگێ•• بەقەد خەمو خۆشیو هیواو ئاواتو خەوبینینی مرۆڤەکانی سەر ئەم زەمینە•• حەسەن بەو کراسە سپییەو پانتۆلە خمدارەیەوە •• لەگەڵ ئەو هەموو لەکەو پەڵەو پنتکە ڕەنگاو ڕەنگانەی سەر کراسو پانتۆڵو دەمو چاوو دەستو سەرە قژو ئاڵۆزکاوەکەی هەر لە ڕیشۆڵە دەچێ •• زۆر جار هاوەڵەکانی پێی دەڵێن :

« ــ ئێواران کە لە بۆیەکردن دێتەوە••• هەر دەڵێی ڕیشۆڵەی ! »

ئەویش وا وەڵامیان دەداتەوە :

« ـ خۆیشم هەستم پێ کردووە • »

لە دڵەوەش بیری لە ڕستە ناسکەکەی مریەم دەکردەوە :

« ـ حەسەن•• تۆ لەژێر باری ئەم ڕەنگ‌و بۆیەیە هەر لە ڕەنگاڵە دەچیت •• ئای کە تەیرێکی جوانە ! » •

حەسەن وا وەڵامی دەدایەوە :

« ـ ئـەوە لە بەرچاوی تـۆ وام•• ئەگینا لای هـاوڕێکانم من ڕیشۆڵەم • »

« ـ ناماقووڵیان کرد • »

حەسەن•• ئیمڕۆ ئێوارە پەست‌و نیگەرانە•• ژانیکی تاڵ‌و بێزەوەر دڵی ئازار دەدا•• بەم ئێوارەیە یادی هـاوینی پار دەکاتـەوە••• پار لـە ڕۆژێکی وەك ئیمڕۆدا•• هـەواڵی مریەمی لێ بڕا•• مریەمی خـەون‌و خۆشی•• هیواو ئاوات•• هەقیەتی کە دڵتەنگە•• ئەم ئێـوارە جوانەی ژێر هەتاوی ڕەنگین‌و ئەرخەوانی خۆرنشینی لە بەرچاو لێڵ‌و تاریکە•••

ئا ئێستا گەیشتووەتە گۆڕەپانە چۆڵەکەی نێوان خانووە تازەکان‌و گەڕەکە کۆن‌و دوورەکانی شار •• لەپێشەوەڕا•• گەڕەکە بۆرەکـەی خۆیان وەك کۆمەڵە کولانەو کۆلێتێك دیارە•• کە لێرەوەڕا نزم‌و تێکەڵ‌و بێ ڕەنگ دیارن•• گەڕەکی پڕ لە مـەزن‌و منداڵ‌و ژن‌و پیاوو برسـێتی‌و خەونی ناخۆش‌و ئاژاوەو مردن‌و لەدایك‌بوون‌و بەزین‌و سەرکەوتن•• جارجارەش ئاوڕی لە خـانووە تـازەکان دەدایەوە••• خـانووە چۆڵ‌و بێ‌دەنگەکان•• هەندێ لەو کۆشکانەی هێشتا بۆنی گڵ‌و گەچ‌و چیمەنتۆو بۆیەیان لێ دێ•• کە هێشتا دوورن لە ئاهـەنگ‌و پرسـەی نەبڕاوەی

مرۆڤ•• خۆرنشینەو خەمێکی توند دڵی حەسەنی گرتووە•• تێکەڵ بە زەردەی ڕۆژئاوا دەبێ•• پتر وای لێ دەکا هێدی هێدی بەو دەنگە زوڵاڵو کەرخو غەمگینەی گۆرانییەکی ماتەمینی بچڕێ•• ئەو گۆرانییانەی وەك خوێن لەدەمی دڵەوە دەڕژێن •• وەك فرمێسکی تاڵو گەرم لەچاوی عاشقێکی دوور وڵاتو خۆشی نەدیدە دەبارێن •

ئای گەر بگریایە•• چەندە خۆش دەبوو•• ئەوەندە بگریایە تا ئەم ڕەنگو بۆیەو پەڵانەی سەر چارەو ملو کراسو پانتۆڵەکەی دەخووسانەوە •• دەسڕانەوە•• دەشۆران•• بەڵام وەی لە دڵساردیو مەینەتی••! با ئەم ڕەنگانەش بشۆرێن•• چی دەتوانێ پەڵەو ڕەنگە بۆرو ڕەشەکانی ئەو خەمە قورسانەی ناو ناخو دەروونی بسڕێتەوە••• ئەم گۆڕەپانە چۆڵەوانییە•• خامۆشە•• تەنها دەنگێ لە ئاسمانەوە دێ•• نەغمەی باڵندە ئاسوودەکانی دەمەو ئێوارەن•• بە جووکەو جریکەی ناسكو خۆش ئاواز••• پێشوازی ئێوارەیەکی کپو مەنگ دەکەن•• وەك ئەو گۆرانییە بێدەنگەی قوڵپە قوڵپ لە دڵی حەسەنەوە هەڵدەقوڵێ•• بە شادەمارو دەمارە دەزوولەییەکانیا وەك خوێنی ڕەش دەڕوا•• دەڕوا تا لە بینیا دەبێ بە ئاخێکی گەرمو سەرهەڵدەدا •• بە خەمەوە ڕووەو شینایی ئاسمان سەر هەڵدەبڕێ•• باڵندە سەرخۆشەکانیش ڕووەو قووڵایی ئاسمان بەرز دەفڕین•• وەك لەو ئاخە گەرمە بترسن•• ئاخی پڕ گڕی خەفەت•••

حەسەن بەدەم خەیاڵەوە •• بە سەرسم لە بەردەکان هەڵدەدا••• ئەو بەردانەی خوا دەزانێ چەندین ساڵە لێرەن•• لەجێی خۆیان جێگیر بووینەو ئاوا کەوتوون•• کەس نییە ئاوا حەسەن لە جێگەی خۆی بلەقێنێ•• لای بابات•• بەردیش بە نووکی پێڵاوی ڕێبوارێکی وێڵ

دەکەوێ•• شوێنی دەگۆڕێ•• کە بەر یەکدی دەکەون شەقەیان دێ••
دەنگ دەدەنەوە••• چەند توندتر بەر یەکدی بکەون•• ئەوەندە گەرمتر
دادێن•• پرووشکە ئاگر دەبژێنن•• سەرەتاش ئاگر وا دۆزرایەوە•••
مرۆڤی [یاندرتال]•• یان کەسێ بەر لەوە•• یان دواتر•• بەردێکی لە
بەردێکی دیکە دا•• ئاگر پژا•• پووش و پەلاش و دڕک و دالی ئەو ناوەی
سووتاند •• ئەوسا ئاگر سەراسیمەو شێتی کردن•• لێی ترسان••
دوور کەوتنەوە••• نزیك کەوتنەوە••• جارێ•• دوو سێ•• چوار••
هەر لەوساوە فێرە خۆ گەرم کردنەوەو گۆشت برژاندن بوون••
پاشان •• ئاگریشیان پەرست :

[ ئاگر ••• ئاو •• هەوا •• خۆڵ ]

حەسەن بیر لە « زەرادەشت » دەکاتەوە••• لە « ئاڤێستا »••• بیر
لە لەیەکدانی دوو بەردو گەرمی•• مریەم و خۆشەویستی•• مریەم و
خۆی•• بەس کەسێ نی یە شەقێکی ئاوا خواهانەو پڕ بەزەیی لە حەسەن
هەڵدا•• لێرەوە بۆ شوێنێکی دیکە بیلەقێنێ•• دەنگی بێ•• گەرم
دابێ•• هەر مریەم ئەو ڕێبوارە بوو••• ئەویش زوو ماڵئاوایی کرد••
کێ دەڵێ مریەم دەبێتەوە ••؟ نەشبێتەوە••• هەفتەیەکی تر پەردەی
شانۆ بۆ حەسەن و خەمە گەورەکانی دەکرێتەوە••• چی لە هاوار و خەڵك و
شانۆ گەورەترە ؟! بەلام مریەمیش خەمێکی قورسە•• کەواتە تا هێز لە
قاچ و پێیەکانیدا هەیە•• با شەق لە بەردەکان بدا•• بە شادی یەوە
هەڵدەقۆزێنەوە••• دەڵێی ساوایەکن•• لە خۆشی ختووکەیەکی دایکانە
دەتریقێنەوە••• هەموو شتەکان حەز دەکەن بجووڵێن•• بفڕن••
ڕابکەن•• ئەوەتانێ باڵندەکان سرەوتنیان بۆ نی یە•• گەلای درەختە
دوور و نزیکەکان•• شنەی با•• خۆری ماندوو••• تەنها مردووەکانی
ناو گۆڕستانی سەر گردەکە نەبێ•• چەندەها ساڵە چۆنن هەر وان••

لەژێر تیشك‌و پرشنگی هەتاوی بەیانیان چاو هەڵناهێنن•• لەگەڵ چاو لەیەك‌نانی خۆری ماندووی ئێواران ناخەون•• بێ‌خەیاڵ‌و بێ‌خەونن•• تەنها ئەوان بۆ هەتا هەتایە خەوتوون•• دایکیشی خەریکە ببێ بە میوانێکی هەمیشەی ئەو گۆڕستانە•• نەخۆشی شەکرەو ڕۆماتیزم‌و چاوکزی پەکی خستووە••• حەسەن گەلێ شەوان سەری پڕ لە ئازاوەو خەونی دەخاتە ناو کۆشی پڕ لە میهری دایکی‌و•• ئەویش وەك سەردەمی ساوایی دەیلاوێنێتەوە••• بەیەکەوە دەگرین•• دایکی بە برین‌و خەمی حەسەن نازانێ••!

ئاوڕێکی دیکەی لە کۆشك‌و خانووە تازەکان دایەوە•• ئەمشەویش پیرە باوك•• وەك زۆربەی شەوانی دیکە هەر لەوێندەرێ دەنوێ•• لەوێ‌و بەتەنیا•• لەنێو تاریکی‌و سەبیل‌کێشان‌و هەناسەتەنگی‌و خەوی سووك‌و بۆنی بۆیەو گڵ‌و گەچ•• هێشتا هەر ئەو باشترە لە پیرە دایك••••

« ـ حەسەن•• من دایکت نیم•• دوا ئەندامی لەشم•• چاوەکانمن کە دەمرن • »

باشتر•• هێشتا بەربێی خۆی دەبینێ•• بینایی تەواو کزنەبووە•• دڵتەپی وا لە مرۆڤ دەکا چاوەکانی هەر بە دنیاوە بن•• جوانە تا دوا ساتی مردن•• ئادەمزاد جوانی هەر بە چاوی خۆی ببینێ•• وەك چرا کوژانەوەی بەرە بەیانی‌یەکی تاریك‌وڕوون•• نەك کوژانەوەی نێو تاریکەشەو••• مرۆڤ کە لە دایك‌دەبێ•• چاوەکانی وەك هی پشیلە نەپشکوتوون•• هەرواش نابێ بمرێ•• لە تاریکی‌یەوە بۆ تاریکی•• ئای لەو سەفەرە سەیرو سەختە !

پیاسەی تەنیایی دەمەو ئێوارانیش خۆشە•• گەر دڵ خۆش بێ••

لەشیش لەژێر باری کارو ئـــەرکی قورسی ڕۆژێـکی دوورو درێژدا نەڕزابێ•• کۆستێکی گەورەش برینێکی گـەورەی نەخستبیتە دڵ•• خەیاڵی مریەم تین و تـاوی لێ سـەند•• چەند پۆلە ڕەنگاڵەیـەك برینی یادەکەیان وەك ئیمڕۆو دوێنێ تازە کـردەوە•• برینەکـە خـوێنی لێ دەتکا•• کێ هەیە خوێنی برینێکی نهێنی ڕابگرێ •

[ « ـ حەسەن•• ڕەنگاڵەکان جوانن•• لە تۆ دەچن!

ـ جوانن•• ڕاستە•• بەڵام من ڕیشۆڵەکانم خۆشتر دەوێن•

ـ تۆ هونەرمەندی•• چۆن دژ بە جوانی دەوەستی ؟

ـ ئاخر لای من ڕیشۆڵەکان گوناهترن•• گەرچی لە ڕەنگاڵەکان ناشیرینترن !

ـ کێ دەڵێ گوناهترن ؟

ـ من•• زستانان ڕاو دەکرێن و خەڵکی گۆشتیان دەخوا•••

ـ قەت وا سادەو ساویلکە نەبووی •

ـ بۆچی ؟!

ـ ئێ خۆ ڕەنگاڵەش بۆ جوانی دەخرێتە قەفەزەوە

ـ ئێ کەواتە هەردووکیان گوناهن •• بەڵام••• مریەم من هەر ڕیشۆڵەکەم بێ گوناهترە •

ـ سەیرە••• تێت ناگەم !

ـ ڕەنگاڵەکان جوانترن و ڕۆژێك دێ قەفەزەکان نەمێنن و سەربەست بن •• بەڵام ڕیشۆڵەکان دەکوژرێن •• جاریکی دیکە بـە سـەربەستی نافڕنەوە !

ـ تۆ دوورو قووڵی دەکەیتەوە•••

ـ خۆی وایە••• مریەم••••

••••ئای مریەم•• خۆی وایە•• خۆی دوورو قووڵە•• ئەگینا چی منی ڕەنگاڵەی بەردڵتی کرد بە ڕیشـۆڵە•• ڕیشـۆڵەیەکی بۆرو ناشیرین•• چی ڕێگەی جودایی‌و ماڵئاوایی خستیتە بەردەم•• ئەوسا کە لەگەڵ تۆدا بووم•• ئەم ڕەنگ‌و بۆیانە چەند جوان‌و ڕەنگین دەهاتنە بەرچاوم•• چەندەها جار ڕەنگە ڕەش‌و بۆرو ساردو ناشیرینەکانم بە قۆنتەراتچی‌و خاوەن کۆشک‌و گیرفان‌پڕەکان دەگۆڕی•• دەمـوت : ئێوە لە ڕەنگ نازانن•• ڕەنگی کـراوە زۆرن•• ڕەنـگی دڵتەزێن•• وەك ئەو ڕەنگانەی لە پەلکە زێڕینەدا هەن •• ئەو ڕەنگانـەی ڕەنـگی ئەرخەوانی خۆرئاوا دەنوێنن•• یان سپێدەی بەیانی‌یەکی زیوینی بەهار•• یان شینایی ئاسمانێکی بێ‌گەردی دوای باران‌و هـەور ڕەوینـەوە ••• بەقەد کچی شۆخ‌و جوان•• ڕەنگی جوان هەن !

مریەم•• لە ڕۆژێکا کۆشکێکم بۆ ڕەنگ دەکرا•• بە هەوەسەوە•• چوست‌و چالاکانـە دەهـاتم‌و دەچـووم‌و•• بـەدەم بۆیەکـردنەوەش کۆشکەکان بە گۆرانی سەرمەستی‌و شێتانەی دڵە عاشقەکەی من دەنگیان دەدایەوە•• لە دەنگدانەوەی هـەزارەها زەنگی خۆشـی پڕ لە زایەڵەو زرنگە دەچوو •••کە لەگوێمدا بزرنگێنەوە••••

زۆر جاریش پڕبەدڵ دەترسام•• لەوە دەترسام‌و زیڕەم دەکرد•• کوڕێکی قۆزی •• پێست سپی•• باڵا بـەرزی•• قژ تەنـکی•• چـاو گەشی ژنانەی یەکێ لەم کۆشکانەی کە بۆیەیان دەکەم : لە منت زەوت بکا •• بـۆیان دەکـرێ : مـریەم•• وەك بۆیان کـرا•• وەك چـۆن دەتوانن ئارەقەی‌ڕەش‌و شینم بێ برێژن•• ئۆخـەی ناکەن تا ئارەقـەی سوێری تێزاب‌ئاسـا چـاوەکانم نەبرژێننـەوە•• بۆیەو ڕەنگی سـەر ڕووخسارم هەر بەو تێزابی ئارەقەیە دەشۆمەوە•• هەر خوا دەزانێ•• چ ڕۆژێکی ڕەش‌و نەگبەتیش چـاوەڕێم دەکـا•• چ ڕۆژێکەو لە چ

هاوینێکی سووتاودایه•• لەسەر یەکێ لە نهۆمە بەرزەکانەوە خۆمو پەیژەکە دێینە خوارەوە •• هەر دوو لای داری پەیژەکەش وەك هەردوو باسکی من لە یەك دەترازێنو دەشکێن •• سەری منیش وەك شووتی گەییو ـ یەکجار گەییو ـ لەسەر تاشەبەردێکی ڕەقی ناو بەردە کەڵەکەکراوەکانی نزیك کۆشکەکە دەپژێو ئەو ناوە ڕەنگ‌ڕێژ دەکا•• مێشکی سپیو ڕیشەی دەمارە پڕ لە ئاه و کەسەری کاسەی سەریشم لەگەڵ سەتڵی بۆیەی ڕەنگاوڕەنگ تێکەڵ دەبێ•• دەبێ بە تابلۆیەکی دەستکردی یەکێ لەو هونەرمەندە شێتانەی سەر بە [ قوتابخانەی کێوی ]ن•• کە لە مێشك‌پژانی ناو کاسەسەری مرۆڤی برسی تێناگەن•• چ تابلۆیەکی مەزنو ڕەنگین دەبێ•• گەر بێنو لە ڕەنگی خەمو خوێنی من بە فڵچەکانیان ڕەنگ بڕژێنن !

مریەم•• زەوتیان کردی•• بۆیان کرا•• بۆیان دەکرێ•• یەکێ لەو کوڕە ناسکانەی هەر لە ئافرەت دەچن : زەوتی کردی•• خاوەن ئەو دەستو پەنجانەی پڕن لە ئەنگوستیلەی عەیار بیستودوو•• ئەوانەی لەگەڵما لە ـبەشی شانۆـ دەخوێنن•• ئەو کوڕە خانمانەی لەگەڵ گەرماو سەرما هاورای دایکیان دەکەن•• ئەوانەی ناتوانن یەك ڕستە لە هاملت، ئۆتیلۆ، ماکبێس••• بە دەمو پلێکی ڕێکەوە بڵێن•• ناتوانن پێنج دێڕ لە شانۆگەری نووسەرێکی خەساوی بێبەهرە بنوێنن•• ئەوانەی تەنها بە کراسێکی کورتی کچانەوە تەواو دەبن بە ژن•• هەر یەکێ لەوانە هەڵیفریواندی•• دەستخەڕۆی کردی•• هەفتەیەکی تر•• بۆ چەند ڕۆژێ لەژێر ئەم ڕەنگو بۆیەیە دێمەدەرێ•• ئەم کراسو پانتۆڵە دادەکەنم•• لەسەر تەختەی شانۆ دەبم بە ( ڤاسیلی ڤاسیلیڤیچ )•• پیرە بەجێماوەکەی ناو شانۆگەری ـ دوا گۆرانیـ چیخوف•••• بێ ژنو ماڵو مناڵ•• بێکەسو خاوەن خەمی کۆشێك ساڵ•• بێجێگەو

بەجێماو•• تەنیا•• پیرێکی ماندووە•• لەگەڵ یادی حەزێکی کۆن و مردوو•• خۆم دەزانم چۆن لەوێ•• لەسەر شانۆکە هەر کتومت دەبم بەو پیرە •• شانۆ گەورەیە مریەم•• تۆ ئەوە دەزانی•• نەشیزانی هەر گەورەیە•• مریەم هەر لەوێ•• لە بەرچاوی خەڵکەکە یادی تۆ دەمگرێنێ•• حەزی تۆ•• ڕەنگی چاوت•• ئەو هیواو ئاواتانەی باستدەکردن •• ئەو ڕۆژەی کە بەجێتهێشتم •• خەڵکی وادەزانن : نواندنە•• نازانن کۆستو نەبوونیو دڵساردی فێری کردووم چۆن ئاگر لەسەر تەختەی شانۆکان بکەمەوە•• تا خەڵکی گەرمبنەوە•• دەبێ دوا گۆرانی مەینەتیو سەرگەردانیو کۆستی ئەو حەزەم بچڕم•• تا دوا هاوارو نرکەو ناڵە بچریکێنم•• لەگەڵ زرێکەم پانکەکانی بنمیچ تیژ بسووڕێنەوە •• تا ئارەقە هەڵچوونی ئەو خەڵکە وشكبکاتەوە •• ئەو خەڵکەی وادەزانن من ئەکتەرمو بەس•• نا مریەم گیان•• تۆ نابوایە بمخەیتە ناو بەلەمێكو بمدەیتە دەم شەپۆلە هارەکانی دەریایەکی سەرشێت•• بێئەوەی سەوڵێکم بدەیتێ•• سوپاست دەکەم•• دەشێ ئەمجارەیان لە هەموو جارانیتر شانۆگەرییەکە گەرمتر بێ•• پڕ لە ئاخو هەناسەساردیو گریانو نەگبەتی بێ•• بێشك زۆریشم چەپڵە بۆ لێدەدەن•• چی لە چەپڵەی ئەوان بکەم••؟ وەك پیرەکە•• پیرەکەی ناو شانۆگەرییەکە حەز بە چەپڵە ناکەم•• من برینــدارم•• کێ هەیە ئەو برینە شاراوەی من ببینێ•• لەبیرتە مریەم•• پێتدەوتم:

« ــــ تۆ دەنگیشت وەك جووکەو جریکەی ئەو ڕەنگالانە خۆشە••

ــــ ئەی ئەگەر ئەو گۆرانییە بوو بە قاژەقاژی ڕیشۆڵە !

ــــ دڵم مەگرە حەسەن•• قەت وانابێ•

ــــ بەس دڵی من وا ناڵێ•••

ــ بیبڕەوە •• دیارە گومانت هەیە •• ها ؟

ـــ ناه•• مریەم گیان•• بەلام من حەزدەکەم لە چاوی تۆ هەمــوو شت بم•• حەزناکەم کەسێکی دیکە ببینی•••

ـــ مەترسە•• نایبینم ! »

ئەی چۆن بینیت••؟ تۆش نەیانبینی•• ئــەوان دەتبینن•• ئەوان ڕاوچی زۆڵو دنیادیدەن•• دەزانن چۆن دەســتبەتاڵ نەگــەڕێنەوە••• ئەو کۆشــکانەی بۆیــەیان دەکـــەم بە هی وەك تۆ شـــۆخو شــەنگ پڕدەکرێنەوە•• وەك شــتومەکە عــەنتیکەکانیان ســەیرتاندەکــەن•• تۆزتان لێ دەتەکێنن•• تۆ نایانناسی•• من هەر لەوانە دەترســـام•• ئەوان بەردی ئەو شاخانەیان بڕاندەوە•• کە پەنای لانەوازو دەربەدەرو پیاوی دڵ پڕ لــە داخ بوو•• مریــەم•• دنیــا وا بڕوا•• چیــا بەســەر زەوی‌یەوە نامێنێ•• ئەوسا چی‌بــکەین؟ ڕۆژێك دێ•• تۆی جــوانیش وەك خشتێکی مەڕمەڕ•• یان کاشــی‌یەکی ڕەنگین‌و نایاب بخــەنە قەد دیوارێکی ئەستوورەوە•• تــۆ نایانناســی•• من دەزانم چــۆن فێڵم لێ دەکەن•• چەندەها جار ئێواران بە دڵســاردی گەڕاومەتەوە•• هــەقیان خواردووم•• هەقی ئارەقەو برژانی بەرخۆری ئاگرگــرتووی هــاوینی درێژ•• وایانلێ کردووم•• نەفرەت لەوکەســە بکەم•• لەو هێــزەی یاسای چەوتی ئەم گــەردوونە بەڕێوەدەبا•• یاســاکەش•• یاســای ئەو گیرفان‌بڕانەیە•• کە لەسەر شانۆ هەرجار ڕسوایان دەکەم•• تۆ ئەگەر وەك من لە شانۆ شارەزا بوویتایە•• لە نواندن•• لە گریان‌و برسێتی•• تۆ ئەگەر خاوەنی پیرە باوکێك‌و دایکێــکی ئیفلیــج‌و چاوکزو برســی بوویتایە•• گەر وەك من بەیانیان لەنێو کۆکــەو بەڵغەم‌و چڵم‌و نــوزەی غەریبی دوو پیر لە خەو وەئاگا هاتبــایت•• دەتــزانی من چی دەڵێم•• ئێستا منیش کۆشکەکانیان لەژێر ڕەنگی ڕەش‌و بۆرو ســاردو مردوودا دەخنکێنم•• وەك جاران حەز لە ڕەنگی کاڵی وەك چــاوانت ناکەم••

ڕەنگی ئاڵی هەردوو کوڵمت•• ڕەنگی زەردو زێڕینی قژە کێوی‌یەکەت•• ئێستا چاوەکانی تۆم لێ دوورن•• ئێستا شەیدای ڕەنگی ئەو کراسانەم لە پرسەکانا پیرەژنە جەرگ سووتاوەکان لەبەری‌دەکەن•• ڕەنگی کراس‌و پشتێنی ئەو گەنجانەی بیر لە برا جوانە مەرگەکانیان دەکەنەوە•• ئەوانەی گەردەلوولێکی کتوپڕ لوولی‌دان‌و بەرەو دەریای مردن ڕاپێچی کردن•• پێشتر دەمزانی چۆن ڕەنگەکان تێکەڵی یەکدی بکەم•• ئێستا تێکەڵی ڕەنگەکانیش وەك دەروونە شێواوەکەمەو تێ‌یان ناگەم•• تۆ منی شووشەت شکاند•• چ پارێزەرێك بگرم تا هەقی من لەو پەنجە قامیش شەکرانەت•• لەو پەنجە بلووریانەت وەربگرێتەوە•• ئەو پەنجانەی لە بینما گیر بوون‌و خنکاندمیان•• کەچی تێر تێریانم مژی•• تێر تێریش ماچم‌کردن•• قورسترین‌و جوانترین مەرگ ئەو پەنجانەت پێ‌یان بەخشیم•• لێت دەبوورم•• بەڵام چۆن لەوان ببوورم••؟! چۆن•• کە لەناو تۆزو خۆڵ‌و ئارەقەو بۆیەو خەم‌و پەژارەدا خنکاندمیان•• سەرباریش تۆیان لێ زەوت‌کردم•• ها•• مریەم گیان••؟ لێت دەبوورم•• ئەوان سواری ئەسپی زین زێڕینن•• منیش پیادەیەکی پێخاوس بووم•• زوو ماندوو بووی•• هەڵیانگرتی•• تۆی ناسك دەخەنە ناو کەژاوەیەکی سپی •• دەتکەن بە پێشەنگی کاروانی بەزم‌و خۆشی ئاهەنگی خۆیان•• گەر بتوانم لێت دەبوورم•• بەڵام چۆن لەوان ببوورم••؟!

ئۆف مریەم•• ئەی عیشقە ڕەنگین‌و•• هەم نابووتەکەم•• ئەی ڕیشۆڵە تەریوەکانی هاوینی ئاسمانی دڵە گەرمەکەم•• مریەم•• گەر بمزانیایە بۆ کام کۆشك لەو کۆشکانەی بۆیەیان دەکەم : دەتگوێزنەوە••؟ گەر بمزانیایە•• پێم لە دڵی خۆم دەناو•• ئەو ڕەنگانەم بەسەردا دەباراندن کە تۆ دڵت پێ‌یان دەکرێتەوە•• ئەو گۆرانی‌یە خۆشانەم تیایدا دەوت••

که تۆ جوان جوان•• شل شل جاران•• سەرت بۆی بادەدا••• وەك شەنگەبی بەر بارانێکی بەهاری تێر دەکەوتیتە سەما•• لەژێریا•• بەو بارانی سۆزە شیرینەم تەڕ دەبوویتو دەلەنگیتەوە••• لە هەموو ژوورەکانا دەمچریکاند•• بۆئەوەی شەوانە هەر ئەو هەواو هەناسەیەم لە ژوورەکانا بسووڕێتەوە••• ببێ بە دوا نوزەی غەریبو مردووی گۆرانی‌یەکەم•• ئەگەریش چی ئەوەیان دوورە••• بەڵکە ئەفسانەی مێشکە گێژەکەی خۆمە••• ئەو مێشکەی خوێنی خەونو خەیاڵی تاڵی تیا دەگەڕێ•• مریەم•• لێت دەبوورم•• چونکە تۆ وەك من لە یاسای خوارو ئیفلیجی ئەوانە تێ‌ناگەی•• ئەگینا بە کەلاوەکەی من ڕازی دەبووی•• ئەو کەلاوەی زستانێکی سەخت بسووڕێتەوە••• دەشێ لەژێر باوو بۆرانو نرکەی گەواڵەو شریخەی بروسکێك ببێ بە خۆڵو گڵو داری سووتەمەنی•• هەر ئەوەندەی خۆڵی کەڵەکەوەبووی سەر گۆڕی پیاوچاکێکی پێوە دەمێنێ•• ئەوە هەموو کۆشكو تەلاری منە•• بەڵام خۆم دەبووم بە پەناو دیوارو سەربان•• سێبەرو ئاسمان•• هەر ئەو دڵە بچووکەی من ئەوەندە گەرمە بە گەورەترین ئاگردانی ماڵە میرێکی خۆشناوەتی ناگۆڕمەوە •• تۆ دەزانی چیتکرد مریەم •• ؟ هەر خۆت بووی دەتوت :

« ـــ هەژاری شەرمەزاری نی‌یە•• حەسەن تۆ بۆ وا بیردەکەیتەوە؟
ـــ دەزانم مریەم ! »

دەزانم•• بەڵام زەوی هەژاری گوڵی سوورو سپی ئەوینی کەم لێ دەڕوێ•• دەزانم•• بەڵام ئاسمانی نەبوونیش کەمتر باڵندەی حەزی لێ دەفڕێ•• جۆگەلەی باریكو کەم‌ئاویش ناگا بە ڕووبار•• ناگا بە دەریا•• هەر لە ناوەندی سەفەرەوە وشك‌دەبێ•• تۆ نازانی•• زۆر جار خۆزگە دەخوازم لەگەڵ پەقرەجی پڕ بۆیەو فلچەی دەستمو

پەیژەکەی ژێر پێم بێمە خوارەوە•• بکەومو سەرانگرێ بم••
پەراسووەکانم وەك پلە کورتەکانی پەیژەکە لە یەکدی بترازێن‌و بڕژێنە
سەر تاشە بەردو خشتە ڕژاوەکان•• تەنها بۆئەوەی هەواڵی مەرگم خۆشی
بووکێنیت لێ تێك‌بداە•• نەء•• تێکی‌نەدا نا خوا نەکا•• بیشێوێنێ••
شێلووی بکاو بەس•• بەڵکو ئەوە خوایە•• مەرگم چەند دڵۆپە
فرمێسکێك لە چاوانت قەرز بکا•• ئەو چاوانەی وایان لێ دەکردم جار
جارە بە بێ‌دەنگی‌و ماتی •• جارجارەش بە ڕقێکی پیرۆزو دڵێکی
پڕشۆڕشەوە بڕوانمە دەمی کراوەی پڕ ویسکی‌و جوێن‌و دڕندایەتی
خاوەن کۆشکەکان•• لەبەر تۆ خۆم لە شەڕیان دەپاراست•• چاوم لە
هەقی خۆم دەپۆشی•• دەمزانی بەتەنیا یاسای ئەوانە ناگۆڕێ•• ئەم
گۆڕینە بڕ‌ی‌و لانەوازی زۆرتری گەرەکە •• تۆ نایان‌ناسی •• هەر
ئەوان تۆیان دزی••!

مریەم•• ئەگەر لە شەوو ڕۆژێکا پیرە باوكو دایك بمرن•• من‌و
کەلاوەیەك‌و برینێکی سەخت دەمێنینەوە•• ئێستەش•• گۆرانی‌یەکانم
بۆنی خەم‌و تامی ئازاریان لێ دێ•• ئەو گۆرانی‌یە خۆشەی جارانم بیر
چووەتەوە•• ئێستا کە ساڵێك سووڕاوەتەوە تۆم لێ دووری•• هاوین‌و
پایزو زستان‌و بەهار•• چوار وەرزی پڕ لە گەرمی‌و ڕەشەباو باران‌و
سەوزی•• بەدەم خۆشن•• زۆر شتم بیر چووەتەوە•• وەك ئەو ڕۆژەی
قژی تەڕت لەبەر باران ئاونگی لێ دەتکا•• بێ‌چەتر بووین•• دەنگم
ئاوا خەم‌و ئاهو نزای لێ دەتکێ•• ئاخۆ ئێستەش وەك ئەوسا حەز بە
پیاسەو ڕۆیشتنی ژێر باران دەکەی••؟ حەز لە بێ‌چەتری دەکەی؟ یان
ئێستا خاتوون‌و کەیبانووی ماڵە گەورەکانی‌و بێ‌چەترو پاڵتۆ ناچیتە
دەرێ••؟ مریەم•• ئەوان بە شنەبایەکی فێنك تووشی هەڵامەت دەبن••
ئەوان هەرگیز منی ژێر گڕی هەتاوی هاوین‌و شەستە بارانی زستان

نین•• ئەوان شـــتێکی دیـــکەن•• دایـــکم دەڵێ: خـــوا داونیەتیو ڕەتبوونەوەی نی‌یە••! وەك ئەو چارەنووسە ڕەشەی تۆی لێ سەندم•• بۆ ئەوان•• باران لە هاوینا دەبارێ•• جۆ بە دیواردا هەڵـدەگەڕێ•• بیابان دەبێ بە مێرگی سەوزو باخی پڕ هەزار بەر•• مریەم ئەم ڕۆژەت لەیادە کە باوکت بۆ دووبارە کۆشکەکەتانی پێ بۆیە کردەوە•• تۆش وتت:

« ـــ تەحا•• لەو ڕەنگ‌ڕشتنە جوان‌و ڕەنگینە•• ئاخۆ هی خۆتان چۆن بۆیە کردووە ؟

ـــ خانم•• هی خۆمان گڵەو بۆیەی ناوێ•

ـــ چۆن••؟!

ـــ ئاوا•• بۆ ڕەنگی خاك‌و گڵ ناشیرینە ؟! »

کە ئەمەم وت•• پێکەنیم•• لەسەر پەیژەکـەوە تێر تێر پێکەنیم•• لە خۆشی ئەو جوانی‌یەو شۆخی‌یەت پێکەنیم•• من لە سەرەوەو تۆ لـە خوارەوە•• دەزانی سیماو ڕووخسارت گۆڕا•• ڕەنگت پەڕی•• سەرت دانەواند•• مات بووی•• بۆ ئەوەی لەو خەیاڵە کورتەت دابڕم•• وتم:

« ـــ خانم•• کەمێ لاچـۆ•• با پرووشـــکی بۆیەکە کراســـە سپی‌یەکەت پیس نەکا• »

وتت « ـــ دەی قەی ناکا •• ! »

بیرتە مریەم•• لە دوو ڕەنگی تەواو جیا•• ڕەنگێکی ترم پەیـــدا دەکرد•• وەك لەسەر شانۆ بگریم‌و پێ‌بکەنم•• یان هـاوار بکەم‌و لەپڕ هەر ئەو زریکەیە ببێ بە چریە•• لە هاوارو چریە چی پەیـدا دەبێ•• لە گریان‌و پێکەنینی تێکەڵ•• لە دوو ڕەنگی تەواو جیا•• لە حەزی دوو

دڵداری سەر بە دوو چینی جیا •• لە یادکردنەوەی ئـەو ڕۆژانەی لـە کەلاوە شڕەکەما گۆرانیم بۆ دەچـڕی‌و ئێستای پڕ لە زرنـگەی زەنگی ماڵئاوایی‌و غوربەت‌و تەنیایی ؟!!

زۆر بە شێنەیی کۆشکەکەی تیوەم بۆیە کرد••• هەستم دەکرد بـە ئارەقەو فرمێسك‌و خوێنی خۆم بۆیەی دەکەم•• درەنگ لێ بوومەوە•• تا بۆ درێژترین ماوە تێر بم لەم بەژن‌و باڵایەت•• کە ئاوی ساردت بۆ دەهێنام•• لە چاوە کاڵەکانت ورد دەبوومـەوە••• ئاسمانی سـەربەستی‌و هەمدەردی خۆم لە چاوانتا بەدی‌دەکرد••• ئەو چاوانەی باریکە دەماری خەمێك سووری نەکـردبوون•• هێشـتا دڵۆپی فرمێسـکێك لێـڵی نەکردبوون•• پەرادخەکەم لێ وەردەگرتی•• تۆ خۆت دەبوویت بـەو پەرداخی ئاوە ساردەو ناو هەناوی گڕ تێ‌بەربوومت فێنك دەکـردەوە•• لەو چاوانەت ورد دەبوومەوە••• کە دوو باخی پاییزی دەهێنایەوە یادم•• خۆم لەو باخەدا درەختێکی ڕووت بووم•• درەختێك بۆ گەڵا ڕژاوەکانی شیوەن بکا•• حەزم دەکرد لە پەیژەکەوە بکەومە خواری‌و•• لە باوەشتا خۆم بگرمەوە••• لە باوەشـی پڕ بـۆن‌و بەرامەت •• ئالاو والا بووی•• دەدرەوشایتەوە •• ژێر پەیژەکەت بەجێ‌نەدەهێشت•• منت دەویست•• نازانم بۆ ؟

خوا حافیز•• ئەی گەڵاو گوڵی وەریوی حەزی وەنەوزی وەرزی پاییز ••!

مریەم•• هۆ مریەم گیان•• دەزانی ئێستە هاوڕێی غەمبارو ئاشقە کۆستکەوتووەکانم•• جار جار شەوانە بۆ بارو مەیخانەکان دەمبەن•• تا ڕەشترین گۆرانیان بۆ بڵێم•• زۆریش ناچم•• جار جاریش دەچم•• دەخۆمەوە••• پێویستیش ناکا بخۆمـەوە••• من بـە ئارەقی یـادی حەزو

دووری چاوانت سەرخۆش‌و مەستم•• لەهەر ساتێکیشدا بمەوێ••
دەگریم‌و قوڕ دەپێوم•• دەڵێن: « ئەکتەری چاکی »••• ئەوانیش نازانن
ئەو دەورەی دەینوێنم•• پاڵەوانەکەی هەر خۆم•• هەموو پاڵەوانی
شانۆگەری‌یەکان•• ئەوانەی عاشقی نان‌و ماچ‌و وڵاتێکی سەوزن••
بەهێزو بەزیوەکانیش•• بگرە ئەو پیرەژن‌و پیرەمێردانەی لەسەر زاری
گۆڕ سەریان دەلەقێ•• لانکی مەرگ دەهەژێنن•• ئەوانە هەموویان :
منم••! شەوان تا درەنگانێ لە نێو دووکەڵی جگەرەو ئارەقی هەرزان‌و
ئاخ‌و ئۆفی ئەو عاقڵە سەرشێتانە دەمێنمەوە••• زۆر جاریش بەیەکەوە
پێدەکەنین•• پاشان دەگرین•• بەس کەسمان لە گریانی کەس
ناپرسێ••!

درەنگ لە بۆیەکردنی کۆشکەکەتان بوومەوە••• باوکت پەلەی
بوو•• کە زانی هەر تەنها بۆیەچی نیم••• قوتابی دوا ساڵی
ئاکادیمیام •• کە تۆش پتر خولیام بووی•• ئەو پتر ترسا•• دەم‌و
دووت دەکردم•• ئەگەر کەس لەوێ نەبووایە لەگەڵ قسە قۆڕەکانما
پێدەکەنیت•• تەواو گومانی لێ کردم•• ئەو ڕۆژەی کە هەردووکمانی
بینی••••• ئۆف•• ئەو ئیشە کوێربێتەوە کە منی خستە سەر ڕێگەت••
من ئیستە ئەو ڕەنگاڵەیە نیم کە تۆ خۆشت‌دەویست•• ئێواران بە
زەوقەوە لەسەر بانی بەرزی کۆشکەکەوە سەیری فڕینیانت دەکرد••
من ئیستە ئەو ڕیشۆڵەیەم لە قاژەقاژم بێزاری•• هەر وەك خۆت دەتوت:

« ــ ڕیشۆڵە لە توخمی قەلەڕەشەو خۆشم ناوێ ! »

گەر دەزانی ئەمساڵ زستانێ•• چەندەها جار ڕیشۆڵەم لە مناڵە
برسی‌و لاسارەکان کڕیوەتەوەو•• بەرەڵلام کردوون•• هەستم دەکرد
خۆم‌و ئازادو سەربەست دەفڕم•• گەر بۆم بلوایە نەمدەهێشت ڕاو

بکرێن•• گەر پارەم هەبووایە•• بە تۆرەوە دەمکرین و•• بەرەو ئاسمانی بێ کۆتایی هەڵم‌دەدان•• ژیانیان لە فریندایە ••!

گەر هەنووکە دەمبینی•• بەتایبەتی ئیمرۆ ئێوارە•• بەو هەموو پنتك‌و نوختەو پەڵەو ڕەنگی ڕەش‌و بۆری سەر کراسە سپی‌یەکەم•• هەر کت‌ومت لە ڕیشۆڵە دەچم‌و هیچی‌تر•• ڕیشۆڵەیەکی باڵ‌شکاوی بەردەستی مناڵێکی دڵڕەق•• گەر بەرەڵلاشم بکا•• بۆم ناکرێ وەك جاران بفڕم•• باڵە سووکەکانم لە یەك بدەم‌و بەرەو زستانی ئاسمانە ساردو دوورەکان هەڵفڕم•• مریەم•• ئەگەر مناڵەکەش ئازادم بکا•• ڕیشۆڵەی باڵ‌شکاو بۆی ناکرێ بفڕێ•• درەنگی ئێوارە•• پشیلەیەکی ڕەش‌و برسی دێت‌و دەمکا بە پارووێەکی چەورو هەناوی ساردی خۆیم پێ گەرم دەکاتەوە••• دەشێ پشیلەیەك بێ لە پشیلە بەرەڵلاکراوەکانی ماڵە خواپێداوەکان•• تۆ نایان‌ناسی•• ئەوان خوێنی منی ڕیشۆڵە دەخەنە بەردەمی پشیلە برسی‌یەکانیان•• تۆ لەگەڵیانا دەژی‌و وەك من شارەزایان نیت•• ئەوان بە بۆیەی ڕەنگاوڕەنگ هەراو بۆگەنی‌و دڕندایەتی ناو کۆشکەکانیان لە بەرچاوی خەڵکی دەشارنەوە••• پیلانە ڕەشەکانیان•• کەس بەقەد ئەوان حەز لە ڕەنگی زەردو سوور ناکا•• قەت•• هەرگیز لەسەر ڕەنگێ ناگیرسێنەوە••• ساڵ نی‌یە دوو جار کۆشکەکانیان بۆیە نەکەنەوە••• لەسەر هیچ شتێ تا سەر ناوەستن•• وەك چۆن ناتوانن لەسەر ئافرەتێ•• خواردنێ•• بەرگێ•• ناوێ•• گۆرانی‌یەك بگیرسێنەوە••• ئاخۆ لەسەر تۆش دەگیرسێنەوە••• مریەم ؟ یان دەبی بە مێزی مەزەو خواردنەوەی چەند شەوێك‌و بەس•• پاشان بە پارچە پەڕۆکێك دەتسڕنەوە••• دەتخەنە ناو بەرمیلی زبڵەکانیان•• زۆرم گۆشت بەرداوە••• ئیستە باریك‌و بنێس‌ترم•• بیرتە کە لەتەکتا دەوەستام پێدەکەنیم•• کە ماچت دەکردم•• کە ماچم دەکردی••

دەبووایە بەسەرما بنووشتایتەوە•• تۆ نەك بالاّت•• تۆ لە هەموو شتێ لە
من کەڵەگەتتر بووی•• دەزانی کەڵەگەتریش دەبی•• من تەنها خاوەن
بەهرەو مێژوویەکی گەورەی برسێتی بووم•• مێشکێکی خەونم بە تۆوە
دەبینی•• هەر من بەتەنها مەرگی مەلی حەزی خۆم نەبینیوە•• زۆربەی
عاشقەکان بەر لە من بینیویانە•• هەر من نیم کە شکانی درەختی سەوزی
حەزی خۆم لە ناوقەدەوە بینیبێ••!

هەفتەیەکی تر•• خۆم دەزانم چۆن لەسەر شانۆ دەگریمو
پێدەکەنم•• هەموو شتێ•• هەموو کەسێ دەخەمە لەرزینو تەزین••
خۆم دەزانم چۆن تەختە ڕەقو مردووەکانی ژێر پێم دەخەمە قسەو
دەیاندوێنم•• بزانم کە درەخت بوون•• چەندەها باڵندەی مێ هێلانەی
لەسەر کردنو لەگەڵ یەکەم باڵندەی نێرو نەناسیاو لە شەقەی باڵیان داو
فڕین•• فڕین ڕووەو ئاسمانێکیتر•• دەمەوێ باسی ئەو ڕووبارو
جۆگەلانەم بۆ بکەن کە ئاویان لێ خواردووەتەوە•• باسی ئەو شاعیرانەی
کە لەژێر سێبەرەکانیانا شیعری پڕ لە بۆنچڕیان نووسی•• وا لەو خەڵکە
دەکەم شەو کە دەچنەوە خەون بە دەموچاوی ئارەقاویو گریانو
سووتانی پشکۆی وشەکانەوە ببینن•• هەفتەیەکی دیکە•• داخی تۆش••
مریەم•• هەر لەوێ دەڕێژم•• وەك جارانیش ناتوانی بێیت•• لەسەر
کورسی پێشەوە دابنیشیو لەگەڵما بگریو پێبکەنی•• لە دوایشدا
چەپڵەم بۆ لێ بدەی •• ئەو چەپڵە سووکو ناسکەی دەستە نەرمو
نیانەکانت•• کە لەنێوان هەزاران چەپڵەیتردا دەیناسمەوە•• ئەوان حەز
بە شانۆگەری ناکەن •• شانۆگەری لای ئەوان مێشك تێکدەرو کات
بەفیڕۆدانە•• ئەوان لە زمانی ئاخو داخی مرۆڤایەتی ناو چیرۆکو
شانۆگەرییەکان تێناگەن•• ئەوان بنیادەمی موچڕكو خشتوورەو
ڕاچەنینو گریان نین•• لەکن وان شانۆگەری بۆ پێکەنینەو بەس••

ئەوان تا بۆیان بکرێ حـــەز لە خوشـكو دایکی یەکـدی دەکـەن••
منالەکانیان چاویلکەی کاغەز لە پێنج دیناری سوور دروسـتدەکەن••
خۆشیان شەوانە لە تیاترۆخـانەو کاباریکانـدا هـەر بەو کاغەزی دینارە
جگەرە بۆ تیاترۆو سۆزانییەکان دادەگیرسێنن•• بە پەرداخی کریستال
ئاو دەخۆنەوە••• جرتیش بۆ مەزنترین شانۆگەری لێ دەدەن•• مریەم
تۆ بوویتو خۆزگەت دەخواست لەتەکما بیت•• لەسـەر تەختەی شانۆ
بوەستی•• چیت لە خۆت کرد؟ چیـت لە من کرد ؟ دەترسـێم ڕۆژێ
بەسەرما بێتو خۆم لە پەقرەجێك بۆیەی سوور هەڵبێنم•• بە شەقامەکانا
وەك شێت بگەڕێم•• مەزنو منال بەدوامەوە ڕابکەن•• تۆ ئەوسـا وەك
ڕێبوارێکی سادەی سەرشەقام نامناسیتەوە••• تا ئەو گۆرانییەت بۆ دەڵێم
کە جاران وەك چناری بالابەرز لەگەڵیا دەلەرایتەوە••• سەمات دەکرد••
خۆت بادەدا•• ئەوسا دەمناسیتەوە••• دەمخەیتە ناو جانتا چکۆلانەکەت••
دەمبەیتەوە••• دەمشۆی••بۆنم لێ دەدەی••جلی جوانم لەبەردەکەی••
ڕیشی خەمم بێ دەتاشـی••.وەك منـالێکی هـاروهاج لەسـەر ڕانت
دەمنوێنی •• منیش خەون بە باخێكو کەپرێكو ڕووی تۆوە دەبینم••
بەیانیش لەگەڵ ماچێکی گەرمتا ڕادەچەنمو چاوەکانم پڕدەبن لـە ڕەنگی
چاوتو هەتاوی خۆری کزهەلاتووی بەربەیان•• من لەو زندە خەوانەی
خـۆم بێـزار بـووم•• کـوا چ کۆشکێکـە•• چ ژوورێکـە بـۆی
دەگوێزرێیتەوە•••؟ تا بە خوێنو ئارەقەو فرمێسکی خۆم بۆیەی بکەم••
تۆ ڕەنگو بۆنی خوێنی من دەناسـیتەوە••• تـاقی ئارەقـەو فرمێسـکی
ڕژاوم•• خوێنی ئەو دڵەی تا لە لێـدان دەکەوێ خـرۆکەی حـەزو
ئارەزووی تۆ هەڵدەگرێ•• لەمەودوا هەرچی کۆشکێ بۆیەی بکەم••
ڕەنگێکی ڕەشی سووربا وە••• وەك ئـەو جـەرگەی دەبێ بە خـوێنێکی
مەیبوو•• بەناو هەناودا پلیت پلیت وەك دەلـەمەی هێلکـەیەك دەڕژێو

ناوسك دەكا بە خوێناوە•• بە زووخاوە•• وەك خوێنی ئەوكەسانەی دەستگیرانە شۆخەكانیان لە سەرەمەرگدا دەستیان لێ هەڵدەگرن •

مریەم•• دەست لە بۆیەش هەڵدەگرم•• بەڵام چی بكەم لەگەڵ برسێتیو نەبوونی؟! ئەگینا دەستم لێ هەڵدەگرت•• تۆ نازانی•• من چەندە دڵتەنگم كە كۆشكەكانیان بەم ڕەنگ‌و بۆیانە سواغ دەدەم•• نەخش‌و نیگاری تاق‌و پەنجەرەو شوورەو گوێسوانەو بالكۆنەكانیان بۆ دەڕازێنمەوە••• خوا دەزانێ چەندەها كارئاسكی بێگوناهی وەك تۆی تیا سەردەبڕن•• بەهارو زستان‌و هاوین و پایز تێیەڕین•• تۆ نە دەنگت هەیەو نە ڕەنگ•• چی ونی كردی•• چی لەناو ژوورە زۆرەكانیانا دەتدۆزێتەوە••؟ منت بیر نایەتەوە••• منی شێت‌و شەیدای شانۆو بۆیەو خەم‌و گۆرانی‌و مریەم‌و ••• منی تامەزرۆو عەزرەتی یەك زەردەخەنەی تۆ•• چی ئاشنای كردین•• كێ ئەم دیوارە ئەستوورەی نێوانمان دەڕمێنێ••؟ ئێستا تۆ لەكوێی•• لەگەڵ كێی•• چی دەكەی•• شادی•• خەمناكی••؟ •• بۆ هەفتەیەكی دیكە نایەیت لەسەر تەختەی شانۆ بمبینی•• گوێ لە هاوارو ناڵەو شۆڕش‌و نەگبەتی مرۆڤ بگری•• نركەو گریانی بێئامانی هەڵفڕیوم كە بانی هۆڵەكەی لەگەڵ دەلەرزێ•• فرمێسكی بەخوڕی سەركردووم •• بۆ نایەیت••؟ مریەم•• دەشێ تۆ بگوێزنەوە بۆ یەكێ لەو كۆشكانەی تازە بۆیەیان دەكەم•• ئەوەش ئەوپەڕی شادمانیمە•• بەدرێژایی ڕۆژەكان•• شەوەهای شەو لەو ڕەنگانە ڕادەمێنی•• كێ بۆیەی كردوون•• چ دەست ڕەنگینێ ڕەنگی ڕشتووە؟ دەنگێ لە غەیبەوە دێتە بەرگوێت : « حەسەن »•• نا لە غەیبەوە نییە•• دەنگی دڵی خۆتە••• دەشێ هەناسەی پڕ ئاخ‌و ئۆفیشم لە كون‌و كەلەبەری ژوورەكانا بمێنێتەوە••• كێ ناڵێ بەڕێكەوت ئەو هەناسەیەم هەڵنامژی•• ئەوسا تێكەڵ بە خوێنە گەشەكەت دەبێ•• مریەم•• من

دەیان‌ناسم•• فریویان‌دای•• ڕۆژێ دێ•• ببم•• ببیت•• ببین بە دوو پاڵەوانی سەرەکیی‌و زیندووی ناو شانۆگەری‌یەك•• مریەم•• مریەم•• مریەم •••••» ]

حەسەن•• لە دەنگی بەرزی خۆی وەئاگا هاتەوە••• پەلاری دوو مێرد منداڵی شرۆڵو سەرسەری پتر تەریقی کردەوە :

« ــ ئەم هەتیوە••• چ مریەم•• مریەمیەتی ؟!

ــ تێکچووە•••! »

حەسەن•• شاعیرانە خۆی لە هەردووکیان گێل کرد•• گەیشتە نزیك خانووە قوڕەکانی گەڕەکی خۆیان•• شل‌و شەکەت‌و مەستانە هەنگاوی دەنا•• سەرمەستی خەیاڵی مریەم‌و شانۆو برسێتی مەودای نەدا•• چ زوو گەیشتە ناوئاوایی‌و خەڵکی سەرەڕۆی دەمەو ئێوارە•• بەرلەوەی لە شەقامە سەرەکی‌یەکەی بەری گەڕەك بپەڕێتەوە••• ئاوڕێکی لە کۆشکە تازەکان دایەوە••• نزمترو دوورو تێکەڵ دیار بوون•• منداڵە شڕو لاسارەکانی گەڕەك لە هارو هاجی نەکەوتبوون•• هەموو دەنگەکان لەوناوە تێکەڵ دەبوون : جووکەو جریکەی ڕەنگاڵەکان•• قیژەی منداڵ•• هاواری دایك•• هۆڕنی ئۆتمبێل•• دەبوون بە ئاهەنگێکی پڕ لە ئازاوە•• خوا حافیزی‌یان لە خۆری ئاوابووی دەم کەل دەکرد••• تەمی زەردی خۆرنشین دونیای ئەو ناوەی گرتبووە باوەش•• خانووە قوڕەکان مەزن‌و بەرچاوتر دەرکەوتن•• ئەمشەویش•• وەك سەدەها شەوی دیکە•• پیرە باوك لەسەر کۆشکەکە پاسەوانە•• پیرە دایك لە کەلاوەکە کەوتووە••• هاکا مردو حەسەنی بەتەنیا بەجێ‌هێشت•• لەوبەری شەقامەکەوە•• بە بەری گەڕەکدا•• منداڵێکی بۆرو قژ تۆزاوی لەسەر چیچکان هەڵترووشکابوو••• حەسەن بە چەند بازێ پەڕییەوە••• لە

منالەکە نزیك بۆوە•• ڕەنگاڵەیەك لەناو چنگیدا دەیجریواند •• دەمدەم قاچەکانی دەگرتو دەکەوتە باڵەفڕە•• هەوڵی ئازادیو فڕینی سەربەستی دەدا•• وەك ئەوەی ڕەنگاڵە سەربەستەکانی ئاسمانی سەروو بانگی بکەن•• حەسەن لە بەردەمی منالەکەدا کەوتە سەر چیچکان•• لەو ڕەنگە بەهەشتیانەی سەر پەڕو باڵی ورد دەبۆوە :

« ـــ حەسەن•• ڕەنگاڵەکان جوانن •••

ـــ جوانن ڕاستە•• بەڵام من پیشۆڵەکانم خۆشتر دەوێن ••

ـــحەسەن•• تۆ هونەرمەندی•• چۆن دڕ بە جوانی دەوەستی••»

« ـــ بچکۆل•• ئەم ڕەنگاڵەیەم پێ دەفرۆشی ؟

ـــ هـا ••••

ـــ گرتووتە یا کڕیوتە ؟

ـــ گرتوومە ••••

ـــ نیو دینارت دەدەمێ •••

ـــ هـا•• نایفرۆشم •••

ـــ دینارێك•• دەی عاقڵ بە •••• »

حەسەن دینارەکەی لە گیرفانی دەرهێنا•• خستیە ناو لەپی چەپی منالەکە•• ئەویش سووك دەستی لە ڕەنگاڵەکە بەردا•• کەوتە ناو لەپی ئارەقاوی حەسەن•• منالەکە بە غار دوور کەوتەوە•• لە دوورەوە وەستاو سەیری دەکرد•• حەسەن هەستی بە دڵە لەرزەی ڕەنگاڵەکە کرد•• هەردوو پێلووە وردو تەنکەکانی جوان هەڵدێنان•• بەندێتی ڕەنگی ترسێکی تەنکی لە چاوەکانیا ڕشتبوو :

« ـــ ڕەنگاڵەکانیش بۆ جوانی دەخرێنە قەفەزەوە••

ــ ئێ کەواتە هەردووکیان گوناهن•• بەڵام من هەر ڕیشۆڵەکەم بێ گوناهترە •••

ــ تێت ناگەم••

ــ ڕەنگاڵەکان جوانن و ڕۆژێك دێ قەفەزەکان نەمێنن و سەربەست بن•• بەڵام ڕیشۆڵەکان ڕاو دەکرێن و دەخورێن ••• »

کت و پڕ دەستە نووقاوەکەی کردەوە••• ڕەنگاڵەکە فڕەی باڵی هات•• نیو بازنەیەکی شادانەی سەربەستی دروست کردو بەرەو شینایی ئاسمان هەڵفڕی•• حەسەن سەری هەڵبڕی•• ڕەنگاڵەکە لە بەرچاوی بوو بە مریەم•• لەناو پۆلە ڕەنگاڵەیەکی تردا ون بووە•• کەوتە سەرشێتی ئازادی و فڕینی دوای بەندێتی•• تێك دەئاڵان•• منداڵەکەش بە سەرسامی یەوە زاری داپچڕی بوو•• سەیری حەسەنی دەکرد ••

حەسەن ملی نا•• کەوتە ناو کۆڵانە تەنگەبەرەکانی گەڕەك•• خۆریش کەوتە ئەودیوی خانووە قوڕەکان•• دونیای گەڕەکەکەی بۆ تاریکی بەجێ دەهێشت•• نیوەکەی تری زەوی ڕووناك دەکردەوە•• مۆسیقاو کتێب و پیرە دایك لە کەلاوەکەدا چاوەڕوانی حەسەن بوون•• هاکا پیرە دایك مردو حەسەنی تەنیا بەجێ هێشت•••!

# هیوای ســوور

**غەریب پشدەری**

نابمە ڕووبار •• گەر هاژەو خوڕەم نەبێ
نابمە چیا •• گەر ترۆپکم تەم نەبێ
نابمە درەخت •• چرۆو گەڵا دەرنەکەم
نابمە شەوبا •• هەورو هەڵا دەرنەکەم
نابمە نێرگز •• موژدەی بەهار نەهێنم
نابمە کانی •• ئاوی ڕوون هەڵنەقوڵێنم
نابمە ڕێژنە •• زەوییە وشکان تەڕ نەکەم
نابمە هاوار •• گوێی دوژمنان کەڕ نەکەم
نابمە لافاو •• ڕانەماڵم گابەردان
نابمە هەتوان •• لانەبەم ئێش‌و دەردان
نابمە ئاسۆ •• بە ڕەنگی خۆر سوور نەبم
نابمە ڕێبوار •• عەوداڵی ڕێی دوور نەبم
بەمانەوە خاوەنی هیوای سوورم
بێ‌دەربەستی هەورازو ڕێگای دوورم
پێ لە ئاوزەنگی‌و لەسەر پشتی زینم
( مەم )ی دڵسۆزو شەیدای خاتو زینم

---

هیوای سوور : مەبەست هیوای گەشە •
ترۆپك : لووتکە •
گابەرد : بەردی زل •
هەتوان : مەرهەم •• لێرەدا مەبەست دەرمانە •

# جەربەزە

سالح محەمەد ئەمین

کە دەستیان دایە هەردوو بن باڵت ، خۆ بە زەوی نووساندنەوەکەت داڵدەی نەدایت ، کەوتیتە هاوار هاوارو دەتوت :

— بۆکوێ ••• بۆکوێم دەبەن ؟

بێدەنگی یەکەی ئەوان هێندەی‌تر دەی‌هەژاندیت‌و شەنی خەرمانی یادەکانتی دەکرد ، پشتی ئۆتۆمبیلەکەی تۆیان تێ‌هاویشت چەند کەسێکی‌تری وەك خۆتیان تێ‌ئاخنی‌بوو ، بۆیە لە دڵی خۆتدا دەتوت :

« ــ بڵێی ئەمانەش جەربەزە بن ؟ » •

بۆڵەبۆڵو خوتەخوتی ئەوان‌و تێ‌نەگەیشتنت لە باسەکەیان ئەوەندەی‌تر شریتی دیمەنە ڕابردووەکانی لە گلێنەی چاوەکانتا دەشتەوە •

( ئێوارە خۆت دواخست ، دڵت خەبەری دابوو کە تۆزێك تاریك داهات پێیان دەگەیت ، بڕیارەکەتیان پێ دەڵێت ، لەوەوبەر هەموو لایەنەکانت بە چاکی تاوتوو کردبوو :

« ــ کەی ئەمە ژیانە ، لاقێکم وەك زیادە پەلی دارێکی پەل‌هاوێژ بێ لەبنا بڕرایەوە ، قاچەکەی‌تریشم کە بۆ ساتێکی کەم لە زەوی گیردەکەم؟

تا دارشەقەکانم دەگوێزمەوە ئازارێکی زۆرم دەدا ، دەستێکیشیانم تەنیا دوو پەنجەی پێوە ماوە ، بوونو نەبوونم چوونیەکە ، هەر کەسێکیش بمناسێ بە بینینم نەبێ ، بیری ناکەومەوە ، ئەویش بە چاوێکی بەزەیییەوە تێمدەڕوانێت ، بەڵام دواڕۆژ تەنانەت گەر دوای مردنیشم بێت ، کە زانرا چ کارێکم کردووەو ئەوەی کردوومە لە توانای هەمووکەسێکی کۆکیشدا نییە ، هەرگیز لەبیرناچمەوە ، کەواتە ئەو نەمرییە لە دەست خۆم نادەم ، خۆ ژیانم هەمووی ئازارو ئەشکەنجەو چەرمەسەرییە جا بۆ نەبمە چڵە دارێكو درێژە بە کڵپەی ئاگرەکە بدەم ؟...

بۆیە ئەم ئێوارەیە سووربوویت بۆ بینینیان ، وردە وردە تاقە لاقەکەتو جووتە دارشەقەکانت هەنگاویان دەنا ، بەرەو ئەو جێگایەی کە جار جار پێیان دەگەیشتیتو قسەی خۆشو یادی ڕۆژانی منداڵیو قوتابخانەی ئەوکاتەی پێش کارەساتە جەرگبڕەکەیان بەبیردەهێنایتەوە ، زۆر بەڕێزەوە لەگەڵتا دەدوان ، هەستت بە بوونو نرخی خۆت دەکرد ، هانیان دەدایت کە بێهیوا نەبیت . تا ئەو شەوەی قسەکانیان دا بەگوێتدا :

— مەڵێ من تازە هیچ کارێکم پێ هەڵناسوورێت ، گەر خۆت بتەوێت گەلێك لەوانەی بەلاتەوە بەتوانان زیاترت پێ دەکرێت .

— ئەی ئەوەت لەیادنییە کە لەبەر بزێویو چەلەنگیت ناومان نابوویت جەربەزە ؟

— ئێستاش گەر بتەوێت دەتوانیت هەر جەربەزەکەی جاران بیت .

— بەتایبەتی زیرەکیەکەت هەروەك خۆیەتی .

هەرچەند قسەکانیان ختووکەی دەدایت ، بەڵام فرمێسکت بۆ ڕاگیر نەکرا ... هەروەك لیتاوێکیش بەری قورگتی گرتبێت قسەت بۆ دەرباز نەدەبو .. ئەوانیش هەردووکیان هەریەکەی دەستێکیان دا بە سەرشانتاو

ڕۆیشتن ، کاتێك سەرت بەرز کردەوەو دەستت بە هەردوو چاوە تەماوی‌یەکانتدا هێنا ، بەئاستەم دوو تارمایی‌یەکەیانت لەوسەری کۆڵانەکەدا بەدی کرد • )

کۆکەی یەکێك لەوانەی تەنیشتت هێنایتی‌یەوە پشتی ئۆتۆمبیلەکە ، هەروو هەر بۆڵەیان دەهات ، بە سیماو ڕوو و جۆری قسەو دەست ڕاوەشاندنەکانیاندا دیاربوو کە بێزاری‌یەکەیان لەوحاڵە دەردەبڕی ••• لەو کاتەدا گەیشتبوونە ڕێکی سەری کۆڵانەکەی ڕێکەوتنەکەی تێدابوو•

« لەو کۆڵانەدا بوو لە پێچە باریکەکەی دوای ئەم سەری ، هەر هەمان ئێوارە ، ڕاستت کرد ، پێیان گەیشتیت ، بە ڕوویەکی گەشەوە بەرەو ڕووت هاتن ، هەمووشتێکیان لە ڕووتدا خوێندەوە :

— من هەر زانیم کە بەڕاستی جەربەزەی •

— چۆنمان وت وابو •• کەواتە با هەر وشەی جەربەزەش نهێنی نێوانمان بێت •

— وردە وردە خۆت لە پارە وەرگرتن لە خەڵکی بدزەرەوە •

— چونکە لەمەودوا کارت هەیە ، کارێکی‌وا کە هەتا هەتایە شانازی پێوە بکەیت •

— بەڵام بەرگ‌و ڕوواڵەتەکەت با جارێ وەك خۆی بمێنێ • جارجارەش بۆ چاوبەست پارە لە ناسیاوە نوێ‌کانت وەرگرە • »

وەستانی ئوتومبێلەکەو هاواری نیچیرێکی ئەوان‌و برادەرێکی‌کەی ئێوە ، کتێبی باسەکەی بەڕووتدا داخست ، بە چاکی لە ڕووی ئەویش وردبویتەوە ، لەوە نەدەچوو بیناسیت ، یان جەربەرەت لێ بیستبێت ، بەخۆت‌تدەوت :

— ئەی باشە من چۆن تا ئێستا ئەمانەم نەناسیوە؟... مەرجیش نی‌یە هەموویان بناسم ... ئەمجا خۆت لەمەیان بردە پێشەوە ، دەستت لێ نزیك‌خستەوە، بە هێواشی کەوتیتە هەڵسەنگاندنی، بە دەم‌و پل‌و قسەکانیا لات ئاشکرا بوو کە لەوانە نی‌یە تۆ بۆیان دەگەڕێیت، بۆیە کشایتە دواوەو کەوتیتەوە ناو ئـەو دەم‌و چاوانەی کە جارجـارە جەربەزەیان بەگوێتدا دەدا .

« دوای دوو ڕۆژ بەسەر ڕێك‌کەوتنەکەتدا ، یەکێك لە تەنیشتی ئەودیوی پایـەکەی کە پاڵـت پێـوە دابـوو ، دارشـەقەکانیشت پێـــدا هەڵسپاردبوو ، تۆزێك ڕاماو ئەمجا شانی نا بـە پایەکەوە ، سـەرنجی دایت‌و ، ئەو وشەیەی تۆ بۆی گوێ‌قوڵاغ بووی لە ڕستەیەکدا بۆتـــی بەکارهێنا ، بە درێژایی ئەو دوو ڕۆژە بەهیوای بیستنی ئەوە بوویت کەچی ئەوەتا ، ڕەنگت هەڵبزرکا ، دڵەکوتێت پێ‌کەوت ، کەوتیتە لێوەلەرێ ، دەتویست قسە بکەیت‌و بۆت نەدەهات ، سـاتێك کەوتیتە دروست‌کردنی ڕستە ، هەرچەندە کەرەسەی چاکت لا بو بەڵام لەوکاتەدا ڕێك‌خستنیان بەلاتەوە گران بوو ، هەرچۆنێك بوو بە جرەجرِ وتت :

— بەیارمەتی خۆت لەوبەر کولێرەیەکم بۆ ناکڕیت ؟

دەستت درێژ کرد تا پارەکەی بدەیتێ ، بەڵام ئەو لەوکاتەدا نیوەی شەقامەکەی بڕی‌بوو ... تۆزێك هاتیتەوە سەر خۆت ، لێوەلەرێ‌کەت نەما ، ڕستەی بەجێت لە مێشکتدا ئامادەکرد ، دڵەکوتێ‌کەت زۆر کـــەم بووەوە ، کە هاتەوە لات‌و لەگەڵ کولێرەکەدا سپاردەیەکی دایە دەستت‌و ڕۆیشت ، هەموو ئەرکی دروست‌کردنی ڕستەکانت بە با چوون‌و تەنیـا وشەی سوپاس گەیشتە گوێی . . »

لە دابەزیندا هەر دەستیان دایە باڵی تۆو دایان‌گرتیت ، زۆر خۆت

بە پێوە بۆ نەگیرا ، بە زەویەکەدا پان‌بوویتەوە ، سەرنجی سیمایانت دەداو قسەکانی خۆتت دەهاتەوە یاد :

« - خۆم باش دەزانم نووچدان لەم‌کارەدا بە چیم دەگەیەنێت ، بەڵام ئەو ئەنجامەم زۆر بەلاوە ستەم نی‌یە ، ئەوکاتەی خاوەنی کەس‌وکارو لەشی ساغی خۆم بووم بێ‌ئەوەی هیچ کارێکم کردبێت بەرکەوتم‌و ئاوام بەسەرهات ، بیر لە چ‌خۆشی‌یەکی ئەم ژیانە تاڵەی خۆم بکەمەوە ، چیم لەدەست دەچێت تا بۆی پەرۆش بم ، هیچ‌شتێکی خۆم نی‌یە تا بۆی ناسۆر بم ، پیش ناسینتان جێگەی وێرگولێك یان نوختەیەکم لە کتێبی ژیندا نەگرتبو ، بەڵام ئێستا گەر بڵێم دێڕێك وەیان تەنانەت لاپەڕەیەکیشم داگیر کردوە ڕەنگە ڕاست بێت . »

لەوجێگەیەشدا هەر بە هەمان شێوە بیرت دەکردەوەو بە هەمان چاویلکە دەتڕوانی‌یە ئەوانەی هێنابوویانن ، بەڵام تاقە شتێك کە تەواو بیرتی ئاڵۆزو بەری چاوتی لێڵ کردبوو ، نەناسینی ئەوانە بوو لەتەکتدا ، لەو گێژاوەدا بوویت کە یەکێکیان پشتێنە قایشەکەی یەکێکی گرتبوو دەگریاو دەکڕووزایەوەو دەیوت :

— هەر ئەمجارە وازم‌لێ‌بێنن ... گەر لەمەودوا دیتاَن سواڵ‌بکەم هەرچیەکم لێ دەکەن بیکەن ... !!

# داخەکەی پشـــت دەســتم

فەرهاد پیربال

« زۆر سەیرە •• ! !

خەریکە خۆشییەکی زۆر گەورە شـادەمەرگم دەکا •• !
دەترسم بەیەکجاری لەنێو ئاسوودەیی ئەم بیرهاتنەوەیەدا بمرم ••
چۆن بڕوابکەم •• ئاخر من کەی چاوەڕوانی ئەوە بـووم ، کـە
ئێستە لەپڕ لەم ساتە ناوەختەدا •• بوتڵە عەرەقێکی بۆشی لاڕێگە••
وا سووكو ئاسان •• ئەم وەڵامە پڕتەڵزمەم بەدەستەوە بدات •••
ئەم وەڵامە ونو نادیارەی کە چەندەها ساڵە من بەدوای‌دا دەگەڕێمو
پێی دەتلێمەوە •••
سەیرە • !

چۆن وا لەناکاو ئەم بیرەوەرییە لەناخم‌دا تەقییەوە •• چۆن وا
کتوپڕ ئەو ئەشکەوتە تاریکەی خەمو گومڕاییم بـۆ ڕووناك بـووەوە ،
چۆن ، چۆن ! ؟

بەڵێ من زۆر جار بە شاری ڕەشی پڕیادگارە تاڵـەکانی منـداڵیم‌دا
گەڕاومـەتـەوە •• هـۆی گەلێـك لە دارکاریو تێهـەڵدانو لە مـاڵ
دەرکردنو جنێوو شەپلە تفەکانی باوکمم دۆزیوەتـەوە •• بـەڵام هۆی
ئەمەیان ـ ئەم داغـەی پشــت دەستـم •• لێم‌بـووە تراویلکەیـەك •••

بەندەرێکی ئێگجار دوور •• هەرگیز پێی نەدەگەیشتم؛ هۆیە ناشیرینەکەی و
مانای دزێوو نادیاری ڕووداوەکەیم بیر نەدەهاتەوە •• بەڵام ئێستە ••
که سەیریشە •• چۆن •• ئەوەتا هێور هێور هەروەك خەونێك
دەکەوێتەوە سەر پەڕەی مێشکم ••• بەڵام سەیر بوو ••• خۆ من
تائێستەش نەمدەتوانی باز بەسەر ئەو نەنگی و گومان و گومڕاییەمدا
بدەم •• وەك بڵێی جمکانەی برسێتی و ڕەتاوی و ئازاری ڕۆژانی منالیم
بووبێ ••• قەت لە ناخم جوێ نەدەبۆوە ••• ئەووەختە من چاکیش
بووم •• •• کاتێ کە هەراشتر بووم •• زۆر خەمناکتر •• زۆر
گومڕاتر •• بێحەوسەلەتری کردبووم •• ئەفسووس •• من ئەم هەموو
ئازارو مەینەتییەم چۆن دایە خۆم •• من باشیش بووم •• هەکە
منالکارێکی دیکە بووایە ••• بەڵام ئاخر •• لەگەڵ ئەوەش •• خوایەکا••
ئەم داغە پیس و قەبەیەی سەر دەستم چی بوو •• چی پێ کردم •• تەواو
وەکو برینێکی گوڕووی کرمەڕێز ئاسا •• ئاخر هێند بەس بوو کە من
خۆشم قێزم لێی دەکردەوەو بە بینینی هێلنجم دەهاتەوە ••• ججا
خەڵکی ؟ ! کە سەیرم دەکرد •• منداڵە دەوڵەمەندەکانی دراوسێمان
ئەنگوستیلەی زێڕو سەعاتی خنجیلانە لەسەر دەستیان دەبریسکاوە •••
منیش•• منیش ئەم داغە پیس و ناشیرینە•• بەڵام بۆچ•• ئاخر بۆچ ••
منداڵێکی وەکو ئەوسای من دەبێ چیم کردبووبێ••تەنانەت ئەگەر تاوانێک
زۆر گەورەش•• چۆن وێژدانی باوکێك ئەوەم بێ بە ڕەوا ببینێ چۆن ••
سزای چ تاوانێکی لە تخووب بەدەرم بوو •• خوایەکا •• چی بوو •• ئەم
داغە •• کەی ، بۆ •• لەکوێ •• لەپای چی نرا بەمنەوە •• چیم
کردبوو •• نەمدەزانی •• نەخێر •• من ناهەق نەبووم •• نە، ناهە
نەبووم کە بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە ئەو بێدەنگییە نهێنگرە لە د
بگرم :

بێدەنگی‌یەك كە لە هەستی خۆ بە كەم زانینو گومڕاییو بێهوودەییمەوە هاتبوو •• خۆ من ئەوەتا ئەگەرچی كە ئەمە لەپایزی هەژدەیەمینیشمدام •• بەڵام سەبارەت بەم پەتایەوە بەقەد هیچ گەنجێكی ئاوزەی خۆم ئاسوودەگیو سەمیانیم نەدی •• منداڵیم هەمووی بەشەڕهاتن بوو •• هەرچی ئاشناو هاوڕێیانم هەبوون هەمووم لە بەرچاو ڕەش‌بووبوون •• پاش مردنی باوكەكەشم شتە جوانو چاكەكانم پتر لە بەردڵ شێوێنران •• ئەم خەفەتو گومڕایی‌یە لەگەڵما ڕۆژبەڕۆژ گەورەترو سەختتر دەبوو •• ئیتر هەموو باخچەو شەقامو سەرشەقامە جوانو فێنكەكان •• بەردەم دوكانی تێنسو یاریگەو چاخانەكانیش •• بوون بە دۆزەخ لێم •• قەتم ڕوو تێ‌نەدەكردن •• تاڕادەی ترسانو زەوانی لێ‌یان دەسڵەمامەوە •• ئاخر •• من چۆن بەم هەستی گومڕاییو نامۆییو ڕووزەردی‌یەمەوە خۆم لەنێویاندا بینیباو نەشمردبام •• باش بوو كە هەندێجار شتەكانم لەسەر پەردەی بیر لادەچوون •• بەڵام هەر كە منالێكی شڕۆڵو خەمناكی وەكو خۆم یان لاسووتاوێكی سەر ڕێگەیێكم دەكەوتە بەرچاو •• تەبای جاران دەكەوتمەوە نێو دۆزەخە ڕەشە پڕگومانو گێژاوەكەی خۆم •• هەزار كەڕەت خۆزگەم بەوە دەخواست كە ئەم داخە هەر لە سەرەتاوە تیزابیشی دەگەڵ بووایەو بنرابایە ڕوحمەوە •• خۆ باشتریش وابوو كە •• بەڵام نەخێر •• من بەدەست خۆم نەبوو •• لە هەمووی چێتر ئەوەم بە باش دەزانی كە هەر دوورەپەرێزی‌یەكە هەڵبژێرم •• بەڵێ من قەت شایانی ئەوە نەبووم كە لەنێو هاوڕێیانو كۆڕو قەرەباڵغی‌یاندا ئاسایی بدوێمو پێبكەنم ••• خۆ گەر بەرێككەوتیش تێ‌یان كەوتبام •• دووبارە شەرمی زفتیو هەستی بێزەوەریو ڕیوایی دایدەگرتمەوە •• خۆ ئەگەر قسەیەك ••• لاقەتی‌یەكی واش كرابا تۆزقاڵێك پێوەندیی بە دزێوی‌یەكەی منەوە

هەبووبا •• دەموودەست وەك جرجێكی ترسێنراو لاشە سستو بوودەڵەكەم دەكشاندەوەو ملی ڕێگای بژاڵەیی خۆم دەگرت •• ئاخر بۆ منداڵكارێك زۆر زەحمەتو سەختی‌یە بە داخێكی قەبەو پیسی پشت دەستی‌یەوە بێتو لەنێو خەڵكیو هاوڕێكانی دابنیشێتو بدوێت ، هەمیشەش ئەو داخە دزێوو گوڕووەی سەر دەستی بە لچكێكی كراسە شڕەكەی بشارێتەوە •• گەر بیشارێتەوەش داخە پڕ سوێ قەبەترەكەی ناخی بۆ ناشاردرێتەوە •••

ئاه خوایەكا ! سوپاس بۆ ئەو سەرخۆشە میهرەبانە كە بەم بوتڵە خۆی دوێنێ شەو تەسكینی دەردی دڵی خۆی‌داو ئێستەش هی من ••• من ئەمە ساڵەهای ساڵ بوو شەوانەش خەوم لێ دەزڕا •• سەبارەت بەو دەمساردیو ڕووزەردیو هەستی خۆ بە كەم زانینەم بەرامبەر بە خەڵك •• دەگریام •• لەژێر لێفە شڕەكەمدا ئێستەش بیرمە چۆن چەند بە زەلیلی ، چەند بە كەساسی دەگریام • هەرژەمێك بە قەد « ئەیوب » بۆ برینی كرم تێكەوتووی خۆم دەگریام •• زۆر جارانیش كاتێ كە ماڵە خزمەكانم ، ماڵی پوورم ، یان كچە عازەبەكانی پوورم ، ئەوانەی كە بە جوانیو خشڵو كۆشكو خانووبەرەی خۆیان دەنازین ، كاتێ كە دەهاتنە میوانداریی دایكە كلۆڵەكەم ، چاك بیرمە چۆن لەژێر پەردەی سوعبەتەوە بەردی قسەیان دەگرتە زاتی شووشەیینی بێ‌گەردم ، لەیادمە بە دایكمیان دەگوت :

ــ كوڕەكەت هیچ كچێكیش نابێ شووی‌پێ‌بكا !

ئاه چەندیش ئەو بەختە ڕەشەی خۆمانم خۆش‌دەویست ، كە سەرباری ئەم دزێوی‌یەشم هێند پەرپووتو نەدار مابووینەوە ، دەمویست قسەیەك ، شتێك لە ڕوویان بڵێم ، ئەوشتانەی كە ئەوسات بەس تەنها

وەك كۆمەڵێ جنێوو لۆمە نەبوایە دەرنەدەبڕران •• بەڵام نەء هیچم نەدەگوت •• تەنها بە گریانێکی کپ دڵی خۆمم دەشۆردەوە •• ئەو گریانەی کە ئەوانی •• ئەوانی نێو کۆشکی فیزو تەلاری تێری هیچ بە برسێتیو کلۆڵیو خەمناکیمان ئاشنا نەدەکرد •• هەرچۆنێ بێ •• پێویست ناکا •• وادیاربوو •• ئاه سەیرە •• من دەڵێی تازە پەی بە هەندێ شت دەبەم •• بەڵێ •• ئا •• بێگومان •• ئەگەر من کوڕی باوکێکی هەژار نەبووبام •• ئەم گومڕاییو نەنگی یەم قەت تووش نەدەهات •• ئەوسات ئەوانیش وا هی زەلیلو برینداریان نەدەکردم •• نەء •• دەی با وابێ •• قەیناکە •• من زۆر شت لەو منداڵە ئازاردراوەی ئاخم فێر بووم کە هێشتاش هەر لەنێو ئەم زاتە سووتاوەمدا زیندووە •

دەی باوابێ ••

پێویست ناکا ••

نەء با قەتیش هێند ئاوڕ لەو ڕابردووە پڕگومڕاییو خەفەتە نەدەمەوە نەء ! !

ئەوەیە •• من ناهەق نەبووم •• چۆن ناهەق بووبم •• نەخێر قەت ناهەق نەبووم •• ئاخر لە شاری بەرەڵلاو پڕگوناهو پڕنەفرەتی ئێمەدا •• ئێستەش منداڵە هەژارانیوا هەن •• تاوان دەکەن •• دزیو کەتنی گەورە گەورە دەکەن •• یان بە پیاوە خوێڕی یە تەزبیح بە دەستو سمێڵفشەکانی بەردەم سینەماو چلخانەکان فریو دەدرێن •• داكو باوکیشیان •• پشتە قوونیان •• یان پشتە دەستیان داخ دەکەن •• ئێ ئاخر خۆ منیش منداڵە هەژارێك بووم •• دەست خۆم نەبوو خەیاڵم دە نێو قوڕی پەینی ئەم گومڕایی یانە دەچەقیو دڵم بێ یانەوە دەئەنگوا•• ئێستەش بیرمە هەکە هەموو جار وێنەی ڕووداوێکی زفتیو بێزەوەریی

خۆمم لە خەیاڵدا نەخش دەکرد •• ئارەقەی ڕیسوایی تنۆك تنۆك بە بناگوێمدا دەهاتە خوارێ •• نەدەبوومە تنۆکە فرمێسکێکی زەبوونی‌و دابچۆڕێمە ناخی زەوی •• دڵخۆشیی خۆم بەوە دەدایەوە کە من هیچ ڕووداوو یادگارێکی زفتی واهیی خۆبەدەستەوەدانم بیرنەدەکەوتەوە •• ئەدی چی‌بوو •• ئاه سەیر بوو •• ئەم پەژموردەیی‌و بیرنەهاتنەوەیەم وای لێ کردبووم کە خۆم وەك منداڵکارێکی زۆر بێ‌مێشك‌و بێ‌یاد دابنێم •• کە هەموو جار پرسیاریشم لە دایکە کلۆڵەکەم دەکرد •• لە وەڕسی‌و بێ‌نەزانینی خۆی‌دا •• کۆمەڵێك جنێوی بۆ باوکەکەم دەنارد، کە ئەم مۆرە پڕشەرمەزاری‌یەی دا لەنێو چەوانی منەوە ، هەمووجار دەیگوت : « چما ئەمن تائێستەش دوو قسانم دەگەڵ ئەو باوکە توندو تووڕەیەت کردووە ! ؟ »

ئاه بۆ ئەو باوکە زاڵمەم •• پیاوێکی چەند تووش‌و دڵڕەق بوو •• قومار کردنەکەشی زێتر دڵە گچکەلانەکەی دەکوڵیم •• کە نازانم ئەم خووەشی •• ئا لەوانەیە لەو بێ‌بارەیی‌و بێ‌دەرەتانی‌یەوەی بووبێ کە سەراسەری ماڵەکەشمانی گرتبۆوە •• بیرمە چۆن شەوانی تاریك‌و سارد درەنگانێ کاتێ کە لە قاوەخانەکەی نێزیك ماڵەکەمان •• بە بەدمەستی‌و هیلاکی دەگەڕایەوە •• قومارو عەرەق باخەڵی بێ چۆڵ کردبوو •• لە بێهوودەیی‌و حەزمەت‌و وەڕسیی خۆی‌دا هەرچی بەردی مەستی‌و ڕقی خۆی هەبوو بەسەر دڵی من‌و دایکە کلۆڵەکەمی دەشکاند •• هەندێ شەویش بە هات‌و هاوارو جنێو لە ماڵێ وەدەردەنام‌و ڕێگەی شەقام‌و شۆستە ساردو سامناکەکانی پێ دەگرتمەبەر •• بن‌درەختێك •• کورسیی بەجێماوی چاخانەیەك •• تەنهایی‌و تەڕوونەیی‌و نامۆییمیان دەگرتە خۆ •• ئەم زاڵمە •• چەند دڵڕەقانە •• هەر لە منداڵیمەوە لە مەکتەبی دەرهێنام‌و پەلکێشی دوکانەکەی

خۆیی کردم •• دووکانەکەشم باش بەبیردا دێتەوە •• ئا •• ئێستەش لە بەرچاومە •• دوکانێکی قەسابیی قەبارە ناوەنجی بوو •• لە نێوەڕاستیەوە بە فایبەرێك کردبووی بە دوو لەتەوە •• دەرچەیێکی لە نێوەڕاستدا بۆ هاتوچۆ جێهێشتبوو •• کاری لە بەشی پێشەوەیدا دەکرد •• بەشی دواوەش کە تایبەت بوو بۆ ئێواران پێکی عەرەق و مەزەی تیا دادەناو تێیدا لەگەڵ ئەو ژنە قەرەج و سۆزانییانەی کە وادەی پێ دەدان •• دادەنیشتن و ئاهەنگی تەڕو پڕ ئەلهای خۆیانیان تێدا دەکرد •• ئاه •• من لەو ساتانەدا •• لە برسێتی و ڕەتاویی خۆمدا •• چەند بە کەساسی •• چەند بە ماندوویی •• لە بەردەم دوکانەکە هەڵدەتروشکام •• چەندیش هیوام بەوە دەخواست کە لەوساتانەدا گەر بۆ تەنها چەند ساتێکی کەمیش بووایە ئیزنی دابامایە بۆ نەختێ هیلاکی لە لەش دەرکردن پشوویەك لە باوەشی گەرم و پڕمیهری دایکمدا بدەم •• گەر بۆ تەنها جارێکیش بوایە هەستم بکردایە منیش مناڵێکم ••

ئاه خوایەکا •• بۆچی •• من تائێستەش ناتوانم باز بەسەر ئەو برسێتی و بێ بەرێتی و نامۆیییەی زۆژانی مناڵیمدا بدەم •• ئاه •• من ئێستەش چەند حەزدەکەم ببمەوە ئەو مندالەی جاران و ، باوکەکەم بێتەوە لام ، گەر بۆ تەنها جارێکیش بێ لە باوەشم بگرێ و چنگم پڕبکا لە نوقڵ و پارە •••• چەند حەزدەکەم ببمەوە ئەو مناڵەی جاران ، شەواڵێکی خاوێن و بێپینە لەبەربکەم ، گەر تەنها بۆ بەیانییەکی جەژنیش بێت ، بەدیار فلیمێکی سینەماییی شەڕ ، یان کاوبۆی •• ڕینگۆ •• دابنیشم و •• قەتیش •• گەورە نەبم ! بەڵام نەخێر •• نەخێر •• هەموو ئەو شتانە ئێستە تەنها خەیاڵێکن بە بەرچاومدا دێن و هیچی تر •• ئەم پیاوە منی دوور لە هەموو ئەو شتانە کردبووە سێبەری خۆی •• تەنها ئەو کاتانە لێی جوێ دەبوومەوە ، کە بۆ ئیشێکی ماڵەوە ، چێشت هێنانی

نیوەڕۆیان ، کارێکی زەحمەتو دوور ، یان کە بۆ عارەق‌کرین ، یانیش کە بۆ ژووان پێدانی ئافرەتێکی سۆزانیی دۆستی ، بەرەو گەڕەکێکی دوورو گەرمی پڕ کەندو لەندو پەناو پێچو چڵپـاو دەینـاردم ، تەنهـا ئەوساتانە بوو •• تەنها ئەوساتانە بوو کە من تیایا لەژێر چەپۆکی قورس‌و سێبەری پڕقینی ئەم پیاوە دوور دەکەوتمەوە •• ئاخ •• ئەو مرۆڤـە چۆن بێ‌بەریی کردمو مانای شتەکانی لێ گوڕیم •• تەنانەت بەهۆی ئەم داخەوە مانای خۆمیش •• مانـای هەموو ئەو خۆشـنوودی‌و تـێری‌و ئاسوودەگی‌یەش کە بە سەرسامی‌یەوە لە هاوڕێ پۆشتەو دەوڵەمەندەکانی خۆمم دەدی •• بەلام باشـە ئاخـر من •• نازانم •• هەتا زیندوو بوو چۆن نەمکرد پرسیاری ئەو خەمو گومڕایی‌یەی خۆمی لـێ بـکەم •• زەحمەت بوو •• نەمدەوێرا •• چما ••• هـەر لە منالی‌یـەوە ترس‌و سامێکی ڕەشی واهیی دابوومێ کە لە بەرامبەری‌دا زاتی هیچ نەکەم •• ئەوە‌بوو •• چیم بکردایە •• دەی • •ئاخر من چۆن نیگەران‌و گومڕا نەبووبام •• من لەدوای هەموو لاساری‌و بزۆزی‌یەکم •• لەدوای هەموو شەو میز بەخۆدا کردنێکم دەمزانی لەسەر ئەو تاوانە دیـارکراوەم سـزا دراوم •• یان هەندێ نیوەڕۆیان کە منداڵان مەلەیـان تێـدا دەکـردو ، هەڵماتێنیان لە دەوروپشتی‌دا دەکرد ، دەوێستامو ئێرەییم بە بەختیـان دەبرد ، لەبیرم دەچۆوە کە نیوەڕۆیەو بابە برسی‌ترو هارتر دەبێ •• دەبێ •• چێشتەکەیم بە ساردەوەبوویی‌و درەنگ‌وەختی بۆ دەهاورد ، یان لەوساتانەی کە دەرهەمێك یان دوو درهەمێکم لە دووکانەکەی لـێ دەدزی ، یان کە لەگەڵ منالە دەوڵەمەندێکی دراوسێ بەشەڕ دەهاتم ، لە هەموو ئەوساتانەدا بەئاشکرا هۆی سزادانەکانـی خـۆمم دەزانـی‌و ، ئێستەش یەکەیەکـە وەك ئـەوەی دوێنێ‌و پێری ڕوویان‌دابـێ دێنـەوە بیرم‌و بێ‌یان نامۆ نیم ، بەلام هۆی ئەم داخە •• ڕووداوی ئەم داخە ••

تەواو سەراسیمەو بێنوودی کردبووم •• تا ئەمساتەش هەمیشە خۆمم پێی هەر دەخواردەوە •• ئاخۆ دەبێ چ ڕووداوێکی ناشیرین •• چ تاوانێ •• ڕووی دابێ لێم •• ئەم پرسیارە پرتەڵزمانە تا ئەم ئێوارەیەش هەر دەیانتلاندمەوەو ، وەکو خەنجەرێکی تیژ ڕۆچووبوونە ناخم ، بەڵام ئێستە •• ڕاستی سەیریشە •• چۆن باوەڕ بکەم •• ئەوەتا •• خەریکە شادەمەرگم دەکا •• من ئێستە پێکەنینم دێ •• ئاخر چۆن پێنەکەنم •• من بەورۆژە چۆن پێنەکەنم !؟

ئەو ڕۆژە •• داخ بۆ ئەورۆژە •• باوکەکەم وەك گەلێك ئێوارەی دیکە لە ماڵی ئافرەتێکی سۆزانی ژووانی هەبوو •• دووکانەکەشی بەتەمای من لێ گەڕابوو •• منیش لە دەرەنگانی ئێوارەکە دەست خۆم نەبوو بە میز ئێگجار تەنگەتاو بووبووم •• نەدەکرا بچمە مزگەوتی نێو بازاڕەکەو دووکانەکە بە بێخاوەنی جێبهێڵم •• دەمزانی گەر بهاتایەوەو دووکانەکەی خاڵی بینیبا شێتگیر دەبووو دارکارییەکی کافرانەی دەکردم •• ئەوساتەش من زۆر لەوە شەرمنترو بەتەمەنتر بووم لەنێو بازاڕێکی وا قەرەباڵغدا بەپێوە هەڵمێزێم •• گوریسم لێ گەشتبووە هێچکان •• نەمزانی چۆن بوو خۆم لەودیو فایبەری دووکانەکەمان دۆزییەوە •• لەوێدا کەس نەیدەدیم •• هەرزوو لەوێشدا ترسی ئەوەم لێ نیشت کە ئاخۆ گەر بێتەوەو هەست بە بۆنو گۆماوی میزی من بکا •• چیم بەسەردێنێ ؟ بۆ بەدبەختیم میزەکەم کردە نێو یەکێك لەو بوتڵە عەرەقە لاملکەوتووانەی ئەوێ ، بەمە سیچەنم گرتو هەموو شتێکم بیرچووەوە، تەنانەت بوتڵە عەرەقە پڕمیزەکەش ، هەتا ئەم ئێوارە فێنکەی ئێستە ، من نەمزانی ، چۆن بزانم ، چۆن بزانم کە دوای من باوکم بە سەرخۆشی دێتو هەمان بوتڵە پڕمیزە دەنێتە سەر دەمی خۆیەوە !

# بۆتەی ڕەش

حەمەعەلی وریا

ئەی کچۆلە نازدارەکە
گوڵەباخە بەهارەکە
شیرینە شۆخ و شەنگەکە
خاتوزینە قەشەنگەکە
کچۆلەکەی سەر هەتا پا
جوانتر لە ( مینا ) ـ ( پاتۆنیا )
کوا نازو عیشوە شۆخەکەت ؟
ڕتووشی گۆنا تۆخەکەت ؟
ئارایشی ڕوومەتی گەش ؟
قایتانی لێو ، چاو ، برۆی ڕەش ؟
کوا بەرامەی قژی خاوت ؟
خەستی عەتر ، هی گوڵاوت ؟
کوا ئاهەنگی پێکەنینت ؟
ورشەی ڕازی چاوی شینت ؟
کوا هەنگاوی نووکی پەنجە ؟
بۆ ؟ ونبوە کارو لەنجە ؟
بۆ ؟ ئەو هەموو جوانی لەشە
خنکاوی ناو ( بۆتە )ی ڕەشە ؟

بۆ جوانەمەرگەکەی برات ؟
کە بوو بە قوربانی وڵات ؟

★ ★ ★

منیش سۆزی هەڵبەستەکەم
ناڵەی دەروونە پەستەکەم
ئاخی دڵی ئاگراوی
فرمێسکی چاوی خوێناوی
پێشکەشە بەو پاڵەوانە
کە شەهیدی نیشتمانە
ئەی کچۆڵە نازدارەکە
گۆڵە باخە بەهارەکە
تۆش دەبا بێی لەگەڵ منا
کێو بین لە ڕێگەی دوژمنا
کچیچاك بە تۆزێك وەرە
گوێیەك لەپیرەمێرد گرە
بە زمانە پاراوەکەی
کسپەی سۆزی هۆنراوەکەی
هاوار ئەکا کچۆڵەکە
( بۆتە ) ڕەشە ناسکۆڵەکە :
شەهیدی خاکی نیشتمان
پێویستی نییە بە گریان
جێگای لە دڵی گەلایە
نامرێ تا دنیا دنیایە

# پەپوولە بایـزە

**ئەحمـەد سـالار**

« ••• گلەیـیو گازنـدەی زۆرم هەبـوو ، بەڵام جـارێ لەوەیان گەڕێ •• ئەوەی زیاتر وروژاندمیو بیرەوەری‌یەکانی هێنایەوە یادم ، باسو خواسی پایزە دێرینەکان بوو •• بەو پەپوولەیەی کە نیشانەی لەدەرگادانی پایزە ، منت گەڕاندەوە دۆخی جاران •• ها ، ها ، ها •• بیرتە ؟•• دڵنیام زۆر چاکت لەیادەو بیری منداڵی تیژە ••• »

ئەوەی سەرەوە ، چەند دێڕێك بوو لە نامەی هاوڕێ هونەرمەندە دووروڵاتەکەم •• ئەو نامەیەی کە پارپایز بۆی ناردم • وەنەبێ باسی بۆنو بەرامەی بارانە پایزەو باسی خەزانو رەنگی رەزی کەژانیشی بـۆ نەکردبم •

پاش نیوەڕۆیـە :

بە لای قوتابخانەی ( ئەیوبیـیـە )دا رابوردم ، ئـەو قوتابخانەیـەی قۆناغی سەرەتاییم تێدا خوێند •• ئەمجارەیش لەسەر کورسی‌یە بچکۆلەکانی جێگام بۆوە ••

ــــ حەمە ، چاوت لێ‌یە ؟

ــــ لەچی‌یەوە ؟

ــ ئەو پەپوولە پایزەیەی لەسەر دەرگای قوتابخانەکەوە بەرزبۆوە ، ئەها چووە سەر کەپری مێوەکە •
ــ ئێ ! ( ماوەیەك بێدەنگی )

حەمە ئاگاداری ژانێکی سەیرو ئاڵۆزمە ، یەکێکە لەوانەی لە منداڵییەوە هاوڕێی گیانی بەگیانیمن •

**دەمەو ئێوارەیەکی سەردەمی منداڵی لە شاری هەڵەبجە :**

ــ سەیری ئەو پەپوولەیە بکە •
ــ دەبێ بیگرم •
ــ ئەها هەڵفڕی ، داڵانەکەی جێهێشت ، چووە سەر تەختە بەندەکە ، خۆ هەر بەدواوەیە •
ــ دەیگرم •
ــ سەرکەوتە سەرێ ، چووە سەربان ••
ــ وەرەوە ، تازە بۆت ناگیرێ •
ــ دەچمە سەر هەورەبانەکە •
ــ ئەوە چی بوو ؟•• چی لێ هات ؟
ــ بۆم نەگیرا ، تەواو شەکەت بووم ، گیانم کەوتۆتە سەر ئاو ، ئەگەر بڵێی چاوم لێ بوو چووە نــاو گەواڵــە هەورێکەوە ، لەگەڵ هەورەکەدا سەری هەڵگرت • ( بێدەنگی ) •
ــ حەمە ، ئەڵێم رەنگە لەگەڵ بارانە پایزەی ئەوساڵەدا هاتبێتە خوارەوە •• یان هەروا ماوەتەوە •• ( دوو پێکەنین ، بەڵام هەریەکەیان لە چاوگێکەوەو لە خولیایەکەوە ) •
ــ ئەوەی دەهێنا ؟

— بڕوا بکە ئەو شەوە تا خەو بردمی‌یەوە هەر چاوم بڕیبووە چاوە شینەکانی ئاسمان • وامزانی دڵی لەلامەو دەگەڕێتەوە •
— منداڵی‌یش خۆشە !
— دەزانی چی‌بوو ؟ ئەوە چونکە پێوەی ماندوو بووم‌و ئارەقەم بـــۆ ڕشت ، بۆیە خولیاکانیشم بە چـاوی خۆم بیـنی ، سـەوز بوون‌و چەکەرەیان کرد •

**دەنگێکی ناساز :**

— بۆ خۆ بە ئەسپ زانینەکە چیت کرد ؟
— ئا ، ئێ ، ••• ئەو وەڵامە شتەکەی لە لا دروست‌کردم •
— من بوومایە خۆم بە چی دەزانی ؟
— نازانم •

**۱۹٦۹/٤/۱۲ یە ،**

دەی بەیانی‌یە ،بەغدایە ، قوتابی‌ی ( دراما )ی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانم •• مامۆستا ( ئەسعەد ) لەسەر کورسی‌یەك دانیشت‌و هاتە سەر باسی تاقی‌کردنەوەکانی مامۆستایەکی مەزنی شانۆ :
— لەکاتێکدا کچە قوتابی‌یەك کارەکتەرێکی یاری دەکـرد لەپڕێـکدا
- ستۆپ ـی لێ کرد •
— فەرموو مامۆستا •
— کچەکەم چ‌ئاژەڵێ بوو ؟
— ئاژەڵ ؟ !
— بەڵێ دایکەکەم ، ڕێوی ، شێر ، پڵنگ ،سـەگ ، زەرافـە ،

کاراسك ، مەیموون ••• هەر دەروونە لە هی جۆرە ئاژەڵێك دەچێ ، ئەم تێبینی‌یە بۆ ئەکتەر سوودبەخشە •

**پاش نیوەڕۆیەکە ، لەتەك حەمەی هاوڕێمدام :**

— بەڵێ ئەسپ • چۆن ئەسپێ ؟ •• ئەوانە نا کە جاری جاران ، ڕۆژانێ مەیدان‌داری‌و سوارسوارێن ، بە ئەسپی کەحێڵەو باڵەبان باوی بوو • ئەو سەردەمەی سوارچاك فەقیاتەی لێ بەردەدایەوەو دەیکرد بە قریوە •

— ئەسپ گەلێ شت دەگەیێنێ • فەرموو لەلای پاپلۆ پیکاسۆ ، لە لای لۆرکای شەهید • لە لای جەواد سەلیمی جوانەمەرگ •••

— ئەی لای تۆ ؟

— لە لای من ، نابمە هیچ شتێکی‌دی ، بام لە روانگەی کەسانی دیکەشەوە بێ ، ئەسپە لات بێ دوڵدوڵ بێ یاخود ئەسپەکەی تەروادە ••• من مرۆڤم ، بە هونەر شوورەی تەروادە رووخا ، گرەوە مەزنەکانیش دەباتەوە •

— وام‌زانی ئارەزووی هێلانت هەیە •

— ڕۆژی یەکەم بوو •

( چوونە ناو جەنجاڵەکەوە ، قاڵبوون ، بەرەنگاربوونەوە •• )

— ئای •• پەپوولەکە ئێستا گەورە بووە ، گەورە بووم ، پتر سووتام ، ماندووتر بووم ، بەردەوام‌و سەقامگیر بوو •• گۆمەکە نەك هەر قووڵتر بوو ، بەڵکو بووە زەریا ، چاکتر مەلە فێر بووم •• بوومە زەریاوان‌و رەنجم بۆ دا •••

— کەواتە هەر کۆڵ‌نادەی •

— نەخێر ، بوو بە بیروباوەڕ ، لەوە گەورەتر بووە گەواڵە هەورێ بتوانێ لەگەڵ خۆی بیبات • لەوە تێپەڕی خەوی منداڵی بمباتەوەو

چاوم لێك بنێم ، ئەمەی ئێستای گشت هەورەکانی ئاسمانی سی‌و پێنج ساڵەی تەمەنم لە باخەڵ دەنێ‌و سەربەکڵاوە دەبارێ . ئای لە ترپەی مۆسیقای دڵۆپەی ئەو بارانە ... چاوت لە کێڵگەی تینوو ، زەویی وشك هەڵاتوو ، شەقار شەقارەوە بێ ..

**شەوی ١٤ ـ ١٥ی ئەیاوولی هەشتاو دووە ،**

نیازم وایە کۆتایی گێڕانەوەی ئەم چەپکە یادگارە بهێنم ، پەلەمە بۆ سەربان . دەمەوێ چاوم لە ئاسمانی ئەستێرە پایزەوە بێ . ئەوان تا بەشوێن خۆیاندا خۆر بەدیاری نەهێنن بەجێم ناهێڵن .. خۆرەکەی گەردوگونی بەیانیشم لە شێوەی پەپوولە پایزەیەکی مەزن‌و داگیرساودا ، نەك دەنکە گەنمێ بەڵکو باراشی گشت هەژارانی وا بەکۆڵەوە .. هەست بە هەڵکشان‌و سەرکەوتنێك دەکەم ، ئەگەر لەپێناوی ئەو ئاواتە پیرۆزەدا هەزار چش‌و قیروسیا لە خۆم نەکەم دەك کوێر بم ..

---

باڵەخانەی چەم دڵ ـ دێوانەکەت ،
بانەناو وە خاك سەر ئاسانەکەت ،
تکەش عاجز کەرد خەیاڵت تێشدا
ئازیز بۆ جارێ پا بنیە پێشدا ! ..

**مەولەوی**

---

# وشەی شیرین ٠٠ مەرگی گەورە

شیعری : عبداللە عباس

- ١ -

**یەکەم هەنگاو :**

تۆ ، هەنگاو بوویت •••
من ، لەتۆوە دەستم پێ کرد •••
لەچاو هەموو ئافرەتەکانی دنیادا •••
هەرتۆ دیار بوویت •••
لەژێر بارانی گشتیانا •••
خۆم شۆردەوە •••
هەرتۆم ماچ کرد •••
بەفرمێسکی شیعرەکانم
رووم تەڕ کردی
خەمێکی ڕووناك دروست بوو •••
چەندە جوانی •••
لە سێبەرتا •••
گۆرانی عەشق دروست بوو •••
چەندە شۆخی •••

- ٢ -

خـەون :

ئاوڕ لە ڕۆژی ڕابووردووی ، ئارەزووی خۆم ئەدەمەوە ..
دەنگت ، بەهێز دێتە بەرگوێم
وەك بانگم کەیت ..
بەرەو ڕووت دێم ..
خەونێکی چەندە گرانی ..
خەونێکی چەندە شیرینی
دەست لەناو دەست
بۆ باوەشی بەفری گەرم ، ئەمبەیتەوە ..

★ ★ ★

زووتر نەموت : نیشتمانێکی لاساری
لاساریەکەتم خۆش ئەوێ ..
کە ئەخەوی ...
قینم لێتە
هەتا بڵێی ، خۆشم ئەوێی ..

- ٣ -

ئافرەت :

بەرلەوەی چاوم هەڵبێنم .. ڕووناکی بووی
بەرلەوەی دڵداری فێربم ... مانای دڵداری نەمر بووی ..

پێت گەیشتم
ماچم کردی ••
زانیم •• ئافرەتیت و •• گەورەی ••

- ٤ -

**مەرگی گەورە**

ئەی ئەو ئافرەتەی ئەمکوژیت و نامکوژیت ••
دەست ئەکەیتە مل سێبەرم !
بەجێم دێڵیت ••
لە کام نەورۆزا
بۆ یەکەمجارو بۆ دووا جار ••
لەباوەشما ئەخەویت و
دەست لەمل یەکترا ، ئەمرین •

---

هەنی نەواچان وە فەرهاد ڕەندەن :
نەخش شیرینش نە ڕووی سەنگ کەندەن •
دەك ڕێزان دەس با وەر جە گیان سەندەن !
کێ ئەڵماس نە ڕووی دیدەی وێش شەندەن ؟ !

**خانای قوبادی**

---

# «لویس برایل»ی بیناو دڵسۆز

وەرگێڕانی : عمر عبد الرحیم

ئەم بەسەرهاتە بەسەرهاتی کوێرێکی بەهرەمەندە کە هەموو ژیانی خۆی تەرخان کردووە ، بۆ ئەوەی کوێرەکانی سەردەمی خۆی‌و ، کوێرەکانی دوای خۆشی بەرەو ڕووناکی بباو فێری خوێندن‌و نووسینیان بکا • ئەم مرۆڤە دلسۆزە ڕۆژی ئەدا بەدەم شەوەوەو مانگی ئەدا بەدەم ساڵەوە ، بەدوای ئامانج‌و ئاواتی خۆی‌دا دەگەڕا، بەڵام ، لە سەرنەکەوتن بەولاوە هیچی دەستگیر نەدەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا کۆڵدان‌و وورەبەردانی لا نەبوو ، هەتا توانی چەند نیشانەیەکی ئاسان بۆ پیتەکان‌و نیشانەمۆزیقاییەکان‌و ژمارەکانی ژمێرە دروست‌بکا •

ئەم کۆڵنەدەرە لە ساڵی ۱۸۱۲ ی• ز• دا کە هێشتا بۆنی شیری خاو لە دەمی دەهات‌و لە سێ ساڵان تێپەڕی نەکردبوو ، دوو درەوشەی لە دووکانی باوکە زیندرووەکەی بەردەست کەوت‌و بە ڕاکردن‌و هەڵبەزینەوە هاتە دەرەوە لەپڕێکا لەپەوڕوو کەوت ، درەوشەکان یەکێکیان چاوێکیانی دەربۆقاندو ئەوی‌تریشیان چاوەکەی‌تری بریندارکرد، پاش چەند ڕۆژێك ئەو چاوەشی یەکی‌کەوت‌و پووت‌بووەوە، بەڵام بە چاوی دڵ‌و دەروون لە جاران باشتر دەی‌ڕوانی •

له تەمەنی دەساڵی‌دا خرایە پەیمانگای کوێرەکانەوە لە پاریس ، دەستی‌کرد بە فیربوونی خوێندنو نووسین بەهۆی ئەو پیتە بەرزانەوە کە ئەوساکە باوبوونو بەرزی‌یان دوو ملموپانی‌یان یەك ملم ئەبوو ، فیربوونیش بەمجۆرە پیتانە قاقەزێکی زۆرو کاتێکی فرەی دەویست •

جگە لەوە کە نووسینی کورتە چیرۆکێك چەندەها لاپەڕەی گەرەك بوو •

« لویس برایل » بە شەو خەوی لێ دەزڕاو هەتا فەرداهی ڕۆژ هەر بیری لە دواڕۆژی خۆی‌و کویرەکانی هاوەلی دەکردەوە •

تەنانەت جارێکیان بە باوکی ووت : ئێمە وەکو ئێوە ئەخۆین‌و ئەخۆینەوە ، بۆن ئەکەین‌و قسە ئەبیستین ، ساردو گەرمو نەرمو زبر لە یەك جیادەکەینەوە ، بەس ئەوەندە هەیە عالەمی من‌و هاوەڵەکانم لە عالەمی ئێوە چەپەکترو هەندرانترە ، ئێوە بەدەوو پڕتاو دەنووسن‌و دەخوێننەوە، ئێمەش بە لەپەکوتێ ! هەیهوو ، کە چەند لەیەکەوە دووڕین ، جگە لە خوێندەواریش هیچ شتێك نی‌یە ئێمەی کوێر لەم شەوی ئەنگوستەچاوە رزگار بکا » •

پاش ئەمەی ( برایل )ی بینا پەیمانگای کوێرانی تەواوکرد لە هەمان پەیمانگادا بوو بە مامۆستا.پاش ماوەیەك جارێکیان لە چاپخانەیەکی پاریس‌دا دانیشتبوو هاوڕێیەکی هات بۆلای‌و وتی : مژدەم بدەری ، ئەفسەرێکی فەڕەنسەیی کە ناوی ( شارل بایر )ە ڕێگایەکی تازەی بۆ نووسین دۆزیوەتەوە ، لەبانی پیت خاڵ‌و نیشانەی تایبەتی دائەنێ بۆئەوەی ئەفسەرەکان‌و سەربازەکان بتوانن لە سەنگەرە تاریکەکانیان‌دا ئەو نامانە بخوێننەوە کە بۆیان دێن ، بە بێ ئەمەی پێویستی‌یان بە ڕووناکی ببێ •

« لویس برایل » که ئەم هەواڵەی بیست خەریك بوو گەشکە بیگرێ ، دەمێ پێئەکەنیو دەمێ ئەگریا ، بە هەموو هێزێکیشی مستەکۆڵەیەکی بە مێزەکەی بەردەمی خۆیدا داو بەسەریا ڕەهێڵ بوو •

هاوەڵەکانی ترسان لەوەی شێت بووبێ • هەڵیانساندەوە ، وتی : داوای لێبوردنتان لێ ئەکەم ، چۆن وانەکەم ؟ مژدەی ئەو دڵخوازەیان داوەتێ کە خەریکە پێی پیرۆزو خەناوی خۆی بخاتە ناو شاری کوێرانەوەو لە تاریکستانەوە بەرەو ڕووناکستانو خوێندەواریان با •
دەمودەست کەوتە گەڕان بەدوای ئەو ئەفسەرەدا ، ڕۆژی دوایی دۆزییەوە ، بەوپەڕی ڕێزەوە دەستی خستە ناو دەستیو وتی : گەورەم، ئەمەوێ ئەو ڕێگا تازەیەی خوێندنو نووسینم بۆ باسبکەیت کە شەبەقی ڕووناکی ئەخاتە ناو جیهانی تاریکییەوە ، ئەوەش بزانە کە بە ملیۆنەها گەنجو پیری کوێر چاوەڕوانی ئەم بەرهەمە نوێیەی ئێوەن • ئەفسەرەکە دەستیکرد بە ڕاڤەکردنی نیشانەکانو وتی : ئەم نیشانانە لەکاتی جەنگدا بۆ سەربازو پۆلیسەکان بەکاردەهێنرین ، یەك خاڵ بۆ پێشەوەچوونو دوو خاڵ بۆ پاشەکشێیە • « برایل » وتی : ئەم نیشانانە چۆن دەخرێنە سەر قاقەز بەجۆرێکیوا کە بە دەستلێدان هەستیانپێبکرێ ؟

ئەفسەرەکە وتی : بۆ ئەم مەبەستە دوو درەوشە بەکاردەهێنم لەوانەی زیندرووەکان چەرمی بێ کوندەکەن ، لێرەدا ( برایل ) دایە پرمەی گریان • چ گریانێك ؟ گریانو پێکەنین ، هەنسكو بزەی سەرلێو ، ئەوکاتەی کەوتەوە یاد کە بەهۆی ئەم دوو درەوشەیەوە کوێربوو ، وا ئێستاش بەهۆی ئەم دوو درەوشەیەوە ملیۆنەها کوێر بەرچاویان ڕووناك دەبێتەوەو دێنە ڕیزی چاوساغان •

ئیتر دوای ئەمە برایل پێنج ساڵی ڕەبەق هەوڵی‌دا هەتا توانی چەند نیشانەیەکی ئاسان بۆ پیتەکان‌و نیشانە مۆزیقایی‌یەکان‌و ژمارەی ژمێرەکان دابنێ . هەتا لە ساڵی ١٨٣٧ی ز . دا چەند هەڵبژاردەیەکی لە شیعرەکانی « ملتون »ی نابینا نووسی‌و لە پەیمانگادا بە قوتابی‌یەکانی ئەوت ، جگە لەمەی لە پەیمانگاکانی تریشەوە مامۆستاکانی‌تری بانگ‌ئەکردو باسی خێرایی‌و گورجی ئەم ڕێگایەی بۆ ئەکردن . بەڵام هەندێ لە هاوڕێ بەدکارەکانی لاقرتی‌یان پێ دەهات‌و بە گزی‌کەریان دادەنا . هەر لەم‌کاتەش‌دا بوو (برایل) نامەیەکی بۆ ئەکادیمی فەرەنسا نووسی بۆ ئەوەی ماوە بدرێ ئەم ڕێگا نوێ‌یە بۆ دڵسۆزانی ئەویش ڕوون بکاتەوە ، بەڵام داخوازی‌یەکەی پەسەند نەکراو بەرەو باوان گەڕایەوە ، بە بیانووی ئەمەوە کە گوایا کوێرەکان ئەمەندە خوێندن‌و نووسین دەزانن لە کاروباری خۆیان‌دا بەکاری‌بهێنن ، لەمە زیاتر پێویستی‌یان بە مۆزیقاو شیعر نی‌یە ، دوای ئەوەی ئەم هێرشە نارەوایە کرایە سەر ( برایل ) زوربەی کاتی خۆی لەگەڵ ئەو قوتابی‌یانەدا بەسەردەبرد کە لە کانی بێ‌ئیشی‌دا لە پەیمانگا دەهاتن بۆلای ، تیایانا هەبوو جگە لە خوێندن‌و نووسین فێری کەمان‌و پیانۆ لێ‌دانیش ببوبوو . لەمەبەدواوە ڕۆژبەڕۆژ ناوو شۆرەتی ( برایل ) هەروەکو هەورە بروسکە ئەی‌شریخاند بەگوێی ناحەزان‌و بەدکارەکانیا .

چەند ساڵێکی‌تر بەسەر هەوڵ‌و تێ‌کۆشانی ئەم نابینا مەزنەدا تێ‌پەڕی‌و ڕێکەوتی ناهەموار تووشی نەخۆشی‌یەکی ترسناکی کردو بە دڵ‌شکاوی گردەنشینی ناو ماڵەوە بوو .

دوای ئەمە لە یەکێك لە هۆڵەکانی پاریس‌دا ئاهەنگێك سازکرا ، هۆڵەکە سیخناخ بوو لە گەورەپیاوان‌و خوێندەوارانی پاریس ، دەرزیت

هەڵبدایە نەدەکەوتە زەوی • کچێکی ژیکەڵەو ناسکوڵەی کوێریشــ بە پەنجە نەرمەڵەکانی پیانۆی هێنابووە هەلەکەسەماو پارچەیەك مۆزیقای لێ‌ئەدا ، هێشتا پارچە مۆزیقاکەی تەواو نەکردبــوو لــە هەموولایەکەوە بوو بە چەپڵەرێــزان‌و داوای لێ‌کــرا پارچەیەکی‌تــریان بــۆ لێ‌بــدا ، پارچەیەکی‌تریشی بۆ لێدان ، نەتدەزانی کامیان لــە کامیــان بەسۆزتــرو دڵگیرتر بوو ، ئیتر شیرازەی دابین‌کردن پچڕا ، لە هەمــوو لایــەکەوە ورووکانە کچەو پیرۆزبایی‌یان لێ ئەکرد • بــەڵام قوتابی بەوەفاو بەینەت ڕووی‌کردە ئەم کۆمەڵە زۆرەو وتی : پیرۆزبایی لە من مەکەن ( لویس برایل )ی مامۆستام شایانی پیرۆزبایی‌یــە کــە شاگوڵی گەنجێتی خــۆی لەپێناوی ملیۆنەها کوێری وەکو مــن‌دا ژاکانــدووە ، ئــەو منی فــێری خوێندن‌و نووسین‌و مۆزیقا کردوە • مەخابن‌و سەد داخ لەباتی چاکەو پاداشت بەدکاران خراپەیان لەگەڵدا کرد ، هەرچەندە کە ئێستا خۆشیان پەشیمان بوونەتەوە ، بەڵام لەپاش باران کەپەنەك !• دەبا پێشتان بڵێم : ئێستا ئەم بلیمەتە مەزنەی مامۆستام لە ژوورێکی تەنیادا بە بێ‌کەس لەگەڵ مۆتەکەی مردن‌دا ململانێ دەکاو جواناوی سەرەمەرگ ئەڕێژێ •

بۆ ڕۆژی دوایی هەموو ڕۆژنامەکانی پاریس ئەم هەواڵە گرنگەیان بڵاوکردەوەو کوێرەکان شادەماری مێشك‌و دەروونی خۆیان پێ‌دەهەنوو، کاربەدەستانیش مەزنی ئەم بلیمەتەیان بۆ دەرکەوت‌و بڕیاردرا لە هەموو پەیمانگای کوێرەکانی پاریس‌دا بەم ڕێــگا نوێ‌یــەی ( لویــس برایــل ) بخوێنری‌و بنووسرێ • هەروەها چەند کەسێك لە قوتابی‌یە دڵسۆزەکانیش بە هەڵەداوان چوون بۆلای‌و ئەم هەواڵە خۆشانەیان پێ‌ڕاگەیاند • بەڵام کار لە کار ترازابوو ( لویس ) لە سەرەمەرگ‌دا بوو ، تەنیــا ئەمەنــدە هاتە زمان وتی : سوپاس بۆ یەزدان کە توانیم پەیام‌و پێویستی سەرشانی

خۆم تەواو بکەمو بە شانازی‌یەوە بەرەو ئارامگای هەمیشەیی بڕۆم ، ئیتر ئێوەو ئەم ڕێگایەی کە خولیاو خواستی من بوو •

بەم جۆرە گیانی پاکی ( لویس برایل ) لە تەمەنی چلوسێ ساڵی‌دا لە قەفەزی سنگ پەروازی‌کردو تێکەڵ بە گیانی گیان‌پاکانو دڵسۆزان بوو •

دوای کۆچی دوایی ئەم پیاوە مەزنو بەپەیمانە لەو دێ‌یەدا کە ئەوی تیا کوێر بووبوو پەیکەرێکیان بۆ دروست‌کرد کە بە دوو چاوی ورشەداری پڕ لە سۆزو بەزەیی‌یەوە ئەڕوانێو تەماشا دەکا •

جگە لەوە لە پاریس چەند پەیکەرێکی‌تریان بۆ دروست‌کرد کە نابینانو وەکو خۆی وان •

« خوزگە بەوانەی کە نابینانو بە چاوی دڵو دەروونێکی پڕ لەسۆزەوە تەماشای ژیانو مرۆڤایەتی دەکەن ، نەك ئەوانەی کە بە دوو چاوی گەشەوە نازانن چۆن هەنگاو ئەنێن » ـ وەرگێڕ •

**هەندێك لە زاراوەکان :**

هەندەران : زۆردوور •

دەو : خێرا •

بەیەنەت : وەفا ، شەرت •

پێ دەهەنوو : پێ چەوردەکرد •

بینا : بصیر •

نابینا : کوێر •

کەپەنەك : جۆرە فەرەنجی‌یەکە لە خۆی کلاوبۆرگەی بۆ دروست‌کراوەو کاتی باران لەبەردەکرێ •

# ســـەرنج

خورشــیدە بابان

کە سەیرم‌کرد ئەو پەیکەرە
سەراپای هەمووی گەوهەرە
بەرزی‌و جوانی ئەو باڵایە
کوتومت ئەتوت ئاڵایە
چ ئاڵایەك ، چ ئاڵایە
خۆزگە نهێنی نەبوایە
ئەتزانی چی لە دڵدایە
دڵە وەیاخود دەریایە
بریا نهێنی نەبوایە
باش ئەتزانی کە چی تیایە
کە سەیری گەردنم ئەکرد
ئەتوت گەردنی چیایە
لەناو بێشەی چیاکەدا
بێ‌گومان ( فراز ) ی تیایە
باسی ئەستێرەیەکت کرد
هاتەوە یادم دەست‌وبرد

گوێی نەبوو لە هەورو هەرا
هەر گەش بوو زۆر جوان ئەتریسکا
جارجار لەبەر تریسکەی ئەو
تینی نەبوو تاریکی شەو
ببوورە لە بەرزێتی تۆ
کە نازانم چۆن بێمە گۆ
چۆنت پێشکەش بکەم دیاری !
کە لە یاد نەچین ئێجگاری
مەر لە بەهارێکی شادا
لە نەورۆزێکی ئازادا
کۆسار بگەڕێم خوارو ژوور
هەڵبژێرم یاقووتی سوور
بۆیە ناڵێم گوڵاڵەی ئاڵ
چونکە سەراپا سوورە یاڵ
تۆ بە چارەسەرێکی ورد
منیش بە ئەندێشەی خواکرد
بەڵکو هەردوو کارێك بکەین
ئەو دیمەنە لەیاد نەکەین
تۆ تەماشا ( فراز ) خاتوون
چەندە گرژو مۆنە گەردوون
بۆ ئێمە هەر دانەی داوە
بەڵام هەر خەیاڵی خاوە

# حەســـــەن‌و حســـــەین *

پێشکەشە بە یادی ( نەجیب ســروور ) ی شەهیدو بە ئیسماعیل مەهدەوی‌و ٠٠ بــە حەسەن‌و حسەین خۆیان مابن یا نەمابن٠٠ بە قوربانی‌یەکانی زوڵم‌و زۆر لە هەمــوو کات‌و شوێن‌و وڵاتێکدا ٠

**دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ**

حەسەن‌و حسەین برا بوون
لە دەشتی کەربەلا بوون ٠

باش ئەم دێڕەی ڕۆژانی منداڵیم لەبیرە ، بەڵام ئەو دێڕانەی‌تری لەگەڵیا دەمانووتەوە چوونە چاڵی لەبیرچوونەوەوە ٠

حەسەن‌و حسەینی دەشتی کەربەلا برا بوون ، مەرد بوون ، ئــازا بوون ، شەهید بوون ٠ بەڵام ئەم حەسەن‌و حسەینەی باسیان دەکەم ، نە لە دەشتی کەربەلا بوون‌و نە ئازا بوون‌و نە شەهید بوون ٠

---

(★) ئەم نووسینە چیرۆك بێت، یا یادداشت بێت، یا سکێچی نووسینێ بێت ، هەر وێنەیەکە لە واقیع ، لە دیمەن‌و شەخسیەتی ئــەو دوو برا میسری‌یە هەڵاتووە وەرگیراوە ، کە چەند ساڵێك ، ڕۆژانە ، لە سەرەتای شەستەکاندا لە مۆسکۆ ئەماندین ٠

— ع٠ م٠ —

خۆیان دەیانووت : بەڵێ ئێمە ترسنۆکین ،•• ترسنۆك • کاتێ جەنگ لە شاری گەورەدا ژێرزەمین هەیە  ــ دیارە کونە تەیارەیان نەبیستبوو ــ • زۆر کەس هەر پێش جەنگ دەچنە ژێرزەمینەوە ، هەیە کە فیکەی فڕۆکە هاتن لێ‌ی‌دا ، هەیە کە فڕۆکە پەیدا بوو ، هەیە کە دەنگی بۆمبای بیست •

بۆ هاتنە دەرەوەش هەیە هێشتا دەنگی بۆمبا دێت ، خۆی ناگرێت، دێتە دەرەوە ، هەیە هێشتا فڕۆکە بە ئاسمانەوەیە ، هەیە کە دەنگی فیکەی هێمنی‌و ئاسایشی بیست‌و هەشە پاش ئەوە ••• بەڵام ئێمە ، بەڵێ ئێمە ترسنۆکین ، ترسنۆك ••• ئێمە پاش جەنگ نەبێت لە ژێرزەمین نایەینەدەرێ •

ــ کەواتە لەبەرئەوەیە ناچنەوە قاهیرە •

ــ بەڵێ ، با هەزار جار لەوێ باسی سۆشیالیزم بکرێت‌و ئەم‌و ئەو جرت‌و فرت بکەن ، تا تەواو دانەمەزرێ، ها لەسەر بناغەی زانستی، دە ساڵیش دەوام نەکات سەرناکەینەوە بە وولاتدا •• ئەرێ تو خوا وولاتتان دیوە حاکم لێ‌ی ڕابکات ؟ •

( ئەم قسانەیان پێکەوەو بە دەنگێك دەووت ) • لێرە حاکم نەبوون ، هەر خۆشیان نەیاندەزانی چی بوون • هەر ئەوەبوو جمك بوون ، نۆ مانگیان پێکەوە لە سکی دایکیانا بردبووە سەرو بە یەك سك بووبوون ، لە دەنگ‌و ڕەنگ سیماو بیرو بالادا وەك یەك بوون •

نە کورت نە درێژ ، نە قەڵەو نە لەڕ ، هەردووکیشیان چاویلکەی ڕەشیان لە چاو دەکرد •

چەند ساڵێك پێکەوە لە چایخانەیەك لەگەلیانا دادەنیشتین ، ئێستاش لێکمان نەدەکردنەوە کامەیان حەسەنەو کامەیان حسەینە •

هێشتا نەهاتبوونە ناو خەڵکەوە ، لە کونو کەلەبەری دەستگای زانستگادا منو وەهابی هاوڕێم ناسیمانن •

هاتبوون لەو دەستگایە ئیش بدۆزنەوە •

— ئێمە دادناسو ئابووری‌ناسو نووسەرو شاعیرین •

— کەواتە ، ئێرە جێگاتانە ، لەم دەستگای زانستی‌یەدا ببن بە کارگەر •

بە ناو ژوورو هۆڵو ئەملاو ئەولای دەستگاکەدا گەڕان ، چاویان بڕی‌یە چێشتخانەو شوێنی پاڵتۆو شەپقە هەڵواسینو چوونەوە لای بەڕێوەبەری دەستگاکەو ڕەنگە هەر ئەو جارە یەکە یەکە قسەیان کردبێت :

— حەسەنی برام نەخۆشە ، ناتوانێ لە چێشتخانەکە ئیش بکات •

— حسەینی برام نەخۆشە ، ناتوانێ لە چێشتخانەکە ئیش بکات •

— با لە شوێنی پاڵتۆ هەڵواسین •••

— ئیشی چی‌و چێشتخانەی چی‌و پاڵتۆی چی ؟ بۆ وای تێگەیشتوون؟

— بۆ شوێنی‌ترتان هەیە ، بۆ ئێمە کرێکار نین ؟ کرێکاریمان پێ‌ناکەن ؟

— ئێوە کارگەری دەستگای زانستین ، ئێوە بە ئیشی زانستی‌یەوە خەریك دەبن •

— ئای ڕاستە ، ئێمە دادناسو ئابووری‌ناسو نووسەرین ، شیعریش دەڵێین ••

زۆر جار لە بەردەمی زاناو کارمەندەکانی زانستگادا هەر پێکەوە بە یەك دەنگ بەم پسپۆڕی‌یانەوە خۆیان دەناساند • بەڵام کە دەهاتنە چایخانەکە بچووك دەبوونەوەو نهێنی‌ی دڵیان بڵاودەکردەوە •

— ئێمه لەو دەستگای زانستی‌یە کارگەرین لەوێ دەڵێین : « ئێمە دادناس‌و ئابووری‌ناس‌و نووسەرین ، شیعریش دەڵێین » • کە وامان‌ووت ئەوی باسی یاساو دادگەریمان بخوێنێتەوە دەڵێ : بەڵی ئەمانە دیپلۆمی قانوونیان هەیە ، لە وولاتی خۆیان حاکم بوون‌و کەچی لەدەست ( عەدالەت ! ) ڕایان کردووە ، بەڵام دیارە قورسایی‌یان داوە بە لایەنی ئابووری‌و نووسین‌و شیعرو لەبەرئەوە لە قانووندا کزن •• خۆ ئەگەر بەرهەممان بدەن بە پسپۆڕانی ئابووری دەڵێن :

— پیاو هەر لە شتێکدا شارەزا دەبێ ، کەسێك پیاوی قانوون بێت‌و شیعرو نووسینی هەبێ ، دیارە دەبێ بەرهەمی ئابووری نووسینی ئاوا بێ‌تام بێت •

ئەگەر بەرهەمە ئەدەبی‌یەکانیشیان داینە دەست ڕەخنەگرو پسپۆڕی خۆی ، ئەوە دەڵێ :

— نە ئەمە شیعرەو نە ئەمە نووسینە ، دوو شارەزای قانوون‌و ئابووری هەر ئەوەی خۆیانیان پێ دەکرێ ، با ئەمیتریان لەناو ئەرشیفدا دانرێ • هەڵاتوون‌و کلۆڵن ، داخی دڵ هەڵدەڕێژن ، بەڵام توانای ئەدەبی‌یان هەر ئەوەندەیە •

حەسەن‌و حسەین ماوەیەك بەمچەشنە کاری زانستگایان بردەسەر ، زۆرکەس بەوانی ڕادەبوواردو ئەوانیش بە خەڵك‌و بەو ژیانەیان ڕادەبووارد •

هەر وەك لە سکی دایکیانەوە ، چاوو گوێ‌و لووت‌و ڕوخسارو بالاو دەنگیان هەر یەك بوو ، بە سانتیمەتر جیا نەبوو ، هەروەها خۆشیان

له هه‌موو شتێكدا بڕیاری جیانه‌بوونه‌وه‌یان دابوو • كه‌ باسی به‌رهه‌میشیان ده‌كرد هه‌ر پێكه‌وه‌ یه‌كده‌نگی ده‌یانووت :

ـ له‌ كتێبێكماندا ووتوومانه‌ ، یان له‌ هۆنراوه‌یه‌كی خۆماندا ووتومانه‌ ، یا له‌ دێڕێك شیعری خۆماندا ووتوومانه‌ ••

باسی زۆر كتێب‌و نووسینی خۆیان ده‌كرد ، هیچی نه‌ ده‌نگی هه‌بوو نه‌ ڕه‌نگ • به‌ڵام پیاو ڕاست بڵێت ـ جاروبار هه‌ندێك دێڕیان له‌و ( هه‌زار دێڕی )یه‌ی خۆیان ده‌خوێنده‌وه‌ كه‌ ئه‌ویش حیكایه‌تی خۆی هه‌یه‌ :

وه‌ك خۆیان یه‌ك بیرو یه‌ك ڕه‌نگ‌و ده‌نگیان هه‌بوو ، بڕیاریان‌دابوو هه‌موو پسپۆڕی‌و زانست‌و شاره‌زایی خۆیان لێك‌ده‌ن‌و تێكه‌ڵی بكه‌ن ، شتێك بنووسن شیعر بێ‌و ئابووری‌و یاساو فه‌لسه‌فه‌ • له‌به‌رئه‌وه‌ بڕیاری دانانی ( الفیه )یه‌كیان دابوو • هه‌موو ڕۆژ به‌ دێڕی تازه‌ی ئه‌و ( هه‌زار دێڕی ) یه‌و لێكۆڵینه‌وه‌و لێكدانه‌وه‌ی ، چایخانه‌ گه‌رم ده‌بوو • به‌ڵام وه‌ك بیانه‌وێ فێڵ له‌ خه‌ڵكه‌كه‌ بكه‌ن یا سه‌یری ئاوو هه‌واو بیری ئه‌و ووڵاته‌ بكه‌ن كه‌ داڵده‌ی دابوون ده‌یانووت :

ڕاسته‌ « ابن مالك » هه‌زار دێڕی نه‌حوو سه‌رفه‌كه‌ی به‌ ناوی خۆیه‌وه‌ ناوناوه‌ «الفیةابن‌مالك» به‌ڵام ئه‌م كاره‌ی ئێمه‌ زۆر گه‌وره‌یه‌و له‌ ده‌رگای هه‌موو زانستێك ده‌داو بیره‌كان وه‌رگیراون‌و سه‌ر به‌ ڕێبازێكن له‌به‌رئه‌وه‌ ناویان‌نا ( ئه‌لفیه‌ی ئیبنو ماركس )و ده‌یانووت چۆن ئیبنوعه‌قیل شه‌رحی هه‌زار دێڕه‌كه‌ی ئیبنو مالیكی كردووه‌ ، ئێمه‌ش شه‌رحی ئه‌م هه‌زار دێڕییه‌ی ئه‌و ده‌كه‌ین • خۆ به‌رامبه‌ر به‌ پرسیاری ئه‌وه‌ی له‌م گاڵته‌جاڕه‌ی ئه‌واندا ئه‌وان سه‌ركه‌وتوون یا ماركس ، بێده‌نگ ده‌بوون، یا یه‌كسه‌ر له‌ وه‌ڵامدا ده‌ستیان‌ده‌كرد به‌ خوێندنه‌وه‌ی هه‌زار دێڕه‌ :

**قد قال كارل هو ابن ماركس**
**اصل البلاء القيمة الزائـدة**

ڕۆژێك لەگەڵ وەهابی هاوڕێمدا ڕوومان‌کـردە ئـەو لۆقەنتە ڕۆژهەڵاتی‌یەی زۆرجار پێکەوە نانمان لێ دەخوارد • هێشتا حەسەن‌و حسەین هەر لە کون‌و کەلەبەری زانستگادا دەبینران‌و نەیاندەوێرا نـە بێنە چایخانەو نە خەڵکی وولاتی عەرەب‌و ڕۆژهەڵات ببینن • لامـان سەیر بوو بـە جـووت دانیشتبـوون‌و نانیـان دەخـوارد • تومەز ئەم لۆقەنتەیەی هەموو خەڵکی ڕۆژهەڵات ڕووی تێدەکەن ، ئەوەیە کـە لایان‌وابوو کەس نایزانێ‌و لەو شارەدا هەر خۆیان ئاگادارین‌و دوور لە چاوی ناسیاو بەڕەحەتی نانیان لێ دەخواردو بە یەك‌دەنگ دەیانووت :

— بەڵـێ ، لوقەنتەیەکـی ڕۆژهەڵاتیمـان دۆزیووەتـەوە ، هیـچ ڕۆژهەڵاتی‌یەکی لێ نی‌یە •

کە ئێمەیان لەوێ دی ، ماوەیەك ووڕ بوون‌و هەر خۆیان دەزانن قنیاتی نیوەڕۆیان چۆن بووە •

— ئێمە ناچینە دەرەوە ، هەر لە شوێنی ئاراممانەوە بۆ شوێنی کار • چونکە مەباحیس تیشکی بگرێتە هەرکەس ، لە هەر شوێنێك بێت دووای دەکەوێ‌و دەیکوژێ •

وامانەزانی ئیتر بەو لۆقەنتەیەدا نایەن ، کەچی پاش چەنـد ڕۆژێك ئێمە لەوێ بووین ، ئەوەندەمان زانی قوت‌بوونەوە •

— هاتینەوە ئێرە ، دێینە ئەو چایخانەیـەش کە ئێـوەو ڕۆژهەڵاتی‌و هاووولاتی‌یەکانی ئەمەی لێ دادەنیشن •

بێ‌ئەوەی ئێمە بوێرین لێیان بپرسین ، یا دەم بکەینەوە• خۆیان کەوتنە ڕۆشن کردنەوەی ئەم بڕیارە تازەیە :

ـــ جاران واماندەزانی لێرەش دەستی مەباحیسی لای ئێمە لە هەموو دەستێك درێژترە ، بەڵام ئەمڕۆ بۆمان دەرکەوت کە دەستی دەستگاکەی ئێرە ، لە وولاتی خۆیاندا ، لەوەی لای ئێمە درێژترە• ئەگەر مەباحیسی لای ئێمە دەستی بگاتە ئێرەو بیەوی بۆ کەسێکی درێژ بکات ، ئەوا ئەوەی ئێرە دەیگرێو دەیبڕێ •

ئیتر ئێمە خۆمان بێ ڕانەگیراو بە یەکدەنگ یا بڵێم دوودەنگی ووتمان :

ـــ چۆن ؟ •

ـــ شەو نووستبووین ، ڕۆژ بووبۆوە ، ئێمە هەر نووستبووین ، ئاگر لە تەنەکەی زیادەو پیسایی ژوورەکە بەربووبوو •

ئیتر وێرامان بپرسین :

ـــ لەکوێ ؟

ـــ ئا ئێستا ڕاستتان بێ دەڵێین • لە ژووری ئوتێلەکە ، ئێمە، تائێستا خانوویان نەداوینێ ، لە ژوورێکی ئوتێلی « دانووب » میوانین • کە ئاگر کڵپە دەسێنێ ، خەرێك دەبێت ژوورەکە بگرێتەوە ، خێرا هەستیان بێ کرد ، ئاگرەکەیان کوژاندەوە ئەوسا ئێمەیان لە خەو هەستاند •

ـــ کەواتە ؟

ـــ کەواتە چی حەسەنی برام ؟ •

ـــ کەواتە چی حسەینی برام ؟

ئەوسا هەر دووکیان بە یەك دەنگو پێکەوە وەڵامی ( کەواتە )یان داینەوە •

ـــ کەواتە ، ئەگەر ئەوی لای خۆمان دەستی بۆ درێژکردین ، خێرا

دەستی تێرە دەیگاتێ •• دەیگرێت ، دەیبڕێت •• تـوخوا چایخانەکەتان لەکوێوەیە •••

★ ★ ★

دەمێك بوو هاوەڵەکانی چایخانەکەمان تامەزرۆی بینینی ئەم دوو برا تاقەکەسە دانسقەیە بوون کە باسیانمان بۆ دەکردن • لەبەر ئـەوە کە هاتنە ڕیزەوە بە گەرمی یـەکی شـایان بـە ناسـیاوو دۆسـتی کۆن پێشوازی کران • دیاربوو هاوەڵەکانمان ئەوانیان باش دەناسی ، بەڵام ئەوانیش لە چەند تاوێکدا وا بوونە ناسیاوو هاوەڵی هەمووان وەك هەزار ساڵ بێت پێکەوەبن •

دەتووت لە دەمی گورگ بەربوون ، دیاربـوو سـاڵ زیـاد بوو قسەیان لەگەڵ کەم کەس کردبـوو ، یـا قسەیـان نەکردبـوو • ئیتر دەستیان دایە ووتنو باسو شـیعری جمـك خوێندنـەوەو خەڵکەکەش کەوتنە لێدوانو پەراوێزو بـە دزی یەوە پێکەنین ، خوا بە هەردوو لای دابوو •

منو وەهاب شارەزای دەرەوەو ناو دەروونی ئەوان بووبووین • بەڵام هاوەڵەکانمان ، یا لە خۆشیاندا بێ یا لە بێ ئیشیدا هەر ڕۆژە شتێکی تازەیان لەم سەر گوزەشتەیە زیاد دەکرد •

« لە یەك دەچنو وەك یەك بیردەکەنـەوەو وەك یـەكو پێـکەوە دەدوێن » • ئێمە بەمچەشنە وەسفمان دەکردن • بەڵام وا هاوەڵەکانمان ڕستەیەکی تازەیان خستە سەر ئەم وەسفە •

بەیانـی زوو ، لەسـەر تەگبـیری دوێنێ تاقمێك زوو هاتبوونە چایخانەکە ، هەر حەسەنو حسەین گەیشتبوون ، دەوامکەرانی چایخانە خۆیان کردبوو بە دوو ڕیز یا بە دوو هەڵقەوە • وایانکردبوو هەر لە

دەرگاشەوە ، حەسەنو حسەینی جمك لە یەكتر جیابكەنەوەو هەریەكەیان لە دەوری مێزێك لای تاقمێك دانێن • ئەمەش سەیر نەبوو، چونكە ئەوانیش وایان لێ هاتبوو هەریەكەیان بچنە سەر مێزێكی جیاو قسەو باسی جیا بۆ شەوچەرەی شەوی تەنیاییان كۆبكەنەوە • بەڵام ئەمجارە بە تەگبیر كۆمەڵێ پرسیارو باس ئامادە كرابوو ، لای هەردوو دەستەكە ئەو پرسیارو باسانە هێنرابوونە ناوەوەو ئەم ڕاوە ژیشكەش هەر بۆ جووتە برا سازدرابوو پرسیارەكان وا دانرابوون ، كە لەوەپێش بە خەیاڵی ئەواندا نەهاتبێ‌و پێكەوە باسیان لێ نەكردبێ •

ئەنجامی تاقیكردنەوە ، یا وەڵامی پرسیار ، لەجیاتی ئەوەی لەناو دەفتەری مۆركراودا بنووسرێتەوە لەسەر شریتێ ئامادەكراو لەسەر هەر مێزەوە هاتەوە بەردەمی لێژنەی تاقیكردنەوە ـ كە پاش ڕویشتنی ئەوان لە یەكگرتنەوەی هەر دوو مێزەكە دروستبوو :

ئەنجام :

١ ـ كۆمەڵێك باس‌و پرسیاری یەكگرتوو بە چەند دەنگی جیاواز ( كە دەنگی دانیشتووانی چایخانە بوو ) •

٢ ـ یەك وەڵام‌و یەك لێكدانەوەو یەك جۆرە قسەكردن بە یەك دەنگ یا هەر بە دەنگی تاقەكەسێك ـ مەگەر درۆزن بزانێ لە كامیانا دەنگی حەسەنەو لە كامیاندا دەنگی حسەینە •

لەبیرمە منداڵ بووین یەكێك بترسایە ئاگریان بەسەردا دەكوژاندەوە ، قورقوشمیان دەڕشتە ناو ئاگرەكەوە ، قاڵبی قورقوشمە ساردەوەبووەكە لە دیمەنی هەر گیاندار یا بێ‌گیانێك بچوودایە دەیانووت ـ لەو شتە ترساوەو وا بەم ئاگرو قورقوشمە ترسی ڕەوییەوە•

بەڵام چیت ئاگر بەسەر حەسەنو حسەیندا بکوژاندایەوە هەر مەباحیسەکەی لای خۆیان دەردەچوو ، وا جارێك بە خەیاڵی خۆیان لە ئوتێلەکە ئاگریان بەسەردا کوژێنرایەوە ، بەڵام ئەوان هەر هاواریان بوو :

— بەڵێ ئێمە ترسنۆکین ، ترسنۆك •

ترسی ئەمجارەیان دیاربووو بە ئاگر کوژاندنەوەی ئەم وولاتە دەرنەدەچوو •

— هەرکەس هاتە ئەم وولاتە ، هەر لە فرۆکەخانەوە ، لە سنوورەوە ، تۆنی دەنگی تۆمار دەکەن ، ئیتر لە هەر شوێنێك قسە بکات ، دەنگی دەناسرێتەوە •

رۆژێك خەڵەفیان لەگەڵ خۆیاندا بردبووە ئەو ماڵە تازەیەی پێیان درابوو ، منەتیان بەسەردا کردبوو کە ئەو یەکەم کەسە ماڵیان ببینێ •

خەڵەف کەوتبووە شکوای حاڵ لەدەست بێگوزەرانیو خراپ بەدەنگەوەچوونی ئەو وولاتەی پەنای هێناوەتەبەر •

خەڵەف ووتی :

هەر ئەوەندەم زانی هەردووکیان پەنجەیان بۆ ئەو کونە دیوارە بە شیش داپۆشراوە درێژ کرد کە بۆ هەواگۆڕین لە ماڵانی ئێرەدا هەیە ، لەگەڵ پەنجە درێژکردندا ، ئەمجارە یەك یەك کەوتنە قسە :

— سەیری پەنجەی حەسەنی برام بکە مامۆستا خەڵەف •

— سەیری پەنجەی حسەینی برام بکە مامۆستا خەڵەف •

حیکایەتی ئەوەشیان کە ئەو کونە بایە چۆن بووە بە جێی دەنگ تۆمار کردن ، وا دەگێڕایەوە کە دەیانووت :

— ڕۆژێك لەبەر ئەو كونە دیوارەدا وەستابووین، باسی كەم‌و كووڕیی ناومالّی تازەمانمان دەكرد • هەر ئەوەندەمان زانی بۆ سبەینێ كاربەدەستێك هات‌و ئەو شتانەی بەدیاری بۆ هێناین • ئیتر لەوكاتەوە ببڕای ببڕای بە خراپە لەنێوان خۆشماندا باسی ئێرە ناكەین، ڕەخنە ناگرین، ئەگەر شتێكیشمان پێویست بێت، دەچینە بەردەمی ئەو كونە دیوارەو بەو عەرەبی‌یە فەسیحە باسی دەكەین كە ڕۆژهەلاّتناسان تێ‌ی‌دەگەن •

ئەمانە چووبوونە مێشكیانەوە كەچی دەمی خۆیشیان پێ ڕانەدەگیرا• ڕۆژێك بە پەنجە ئیشارەتیان كردم، ڕوویان كردە دەرگای چایخانەكە، ئەوان ڕۆیشتن‌و من دوایان‌كەوتم، هەر ڕۆیشتن‌و من بەدوواياندا، تا لە گۆڕەپانی لای چایخانەكە پەڕینەوەو گەیشتنە باخچەكەی ئەوبەر، لەوێ وەستان‌و پشتاوپشت هاتنەوە دوواوە تا لەگەلّیاندا ڕیز بووم •

ئەوسا پێكەوە یەكدەنگی كەوتنە قسە :

— هەركەس هاتە ئەم وولاّتە، هەر لە فڕۆكەخانەوە، هەر لە سنوورەوە، تۆنی دەنگی دەگرن، ئیتر لە هەر شوێنێك قسە بكات، دەنگی تۆمار دەكرێت‌و دەنگی دەناسرێتەوە، لەبەرئەوە ئێمە هەر قسەیەك مەبەسمان بێت لە دەرەوە لە هەوای كراوەدا دەیكەین •

— لە هەوای كراوەدا باشە حەسەنی برام •

— لە هەوای كراوەدا باشە حسەینی برام •

— ئەمەم بیستووە، دەی ئەمە هەوای كراوەیە، چیتان پێ‌یە بیلّێن •

— ( پێكەوە بە یەك دەنگ ) هیچمان پێ نی‌یە بەلاّم •••

— بەلاّم ••••

— تۆ کویستانی دەناسی ؟

— دیارە دەیناسم •

— خۆت دیوتە ، قسەت لەگەڵ کردووە ؟ •

— بەڵێ ، دیومە ، لەگەڵیشی دانیشتووم‌و قسەشم لەگەڵ کردووە •

— هیچ باسی خۆی بۆ گێڕاویتەوە ؟ •

— بۆشی گێڕاومەتەوەو زۆریشم دەربارەی بیستووە •

— دەزانی دە ساڵ لەم وولاتە ئاوارە بووە ، باسی ئێرەی بۆ کردوویت ؟

— چیتان دەوێ بپرسن •

— چۆن بپرسین حەسەنی برام ؟

— چۆن بپرسین حسەینی برام ؟

— بپرسن •• بپرسن •••

— کوێستانی ژنی هەیە ؟

— لای خۆمان ژنی هەیە •

— ( پێکەوە ) نا لێرە ، لێرە ژنی پێ‌بوو ، ژنی‌تری هێنا ؟

— ژنی پێ‌نەبوو ، نەشم‌بیستووە لێرە ژنی هێنابێ •

— نەمووت حەسەنی برام • ؟

— نەمووت حسەینی برام ؟

— بپرسن ، چیتان دەوێت ؟

— ئەوە ناپرسرێ حەسەنی برام •

— ئەو ناپرسرێ حسەینی برام •

— لە هەوای کراوەداین ، هەمووشت دەپرسرێ •

— کەواتە چۆن ••• ؟

— وەك هەموو ئەوروپایی یەك •

— نا •• ڕاستناکات ، شتیوا ناگونجێ حەسەنی برام •
— نا •• ڕاستناکات • شتیوا ناگونجێ حسەینی برام •
— بۆچ ناگونجێ ؟ •
— بۆ پیاوی ئاوارەو پەنابەر ناگونجێ ، بۆ بێگانە ناگونجێ ، وێنە دەگیرێو دوایی بەکاردێنرێ •
— خوا بتانگرێ •• بۆ خۆتانو خەیاڵتان ، ••• ئەی چار ؟

هەریەکەیان چنگی چەپی قووچاندو بەرزی کردەوەو بە یەك دەنگ وو تیان :

— هەروەك ئێمە دەبێ ، ئێمە چاكدەكەین ، نیوەی پارەكەمان دەدەین بە کتێبو سابوون •

★ ★ ★

ساڵ هاتو ساڵ ڕۆیشت ، ئەتووت مێژوو لە وولاتی ئەواندا وەستاوە یا دەگەڕێتە دوواوە ، نە ئەو هەنگاوی دەیانویست نراو بازدراو نە دە ساڵی بەسەردا ڕۆیشت •

ئێمە هاتینەوە وولاتی خۆمان ، لە سۆراخی ئەواندا ، یەکێك دەیووت خۆیان چوونەتەوە • بەمحاڵەشەوە لە زمانی بەد ڕزگاریان نەبوو ، کەسیواشی هەبوو ، دەیووت هەر لە سەرەتاوە نێرابوونو بەقەستی خۆیان وا سووكو سەلیم کردبوو ، ئەوەشم بیست کە خانەخوێو داڵدەدەر لێیان وەڕس بوو ، هەر ماوەی ئەوە پەیدا بوو خەڵکی لای ئەوان بە سەلامەتی بگەنەوە ، بێئەوەی لە حیکایەتی ( ترسنۆکیو ژێرزەمین ) ی ئەمان بگەن بە نیمچە باڵبەستی سواری فڕۆکەیان کردنو ناردیاننەوە •

زیادی هاوەڵم هەر لەوساڵەدا ڕێی کەوتبووە قاهیرە ووتی :

ــ وامدەزانی ئەگەر بمبینن باوەشم پێدا دەکەن‌و میواندارێم دەکەن•
بەڵام هەر منیان دی بازیان‌دایە ئەوپەڕی جادەکە ، دووایان
کەوتم ، ئاوڕیان نەدایەوە ، هەنگاوێکم مابوو بیانگەمێ ، زانیان
دەنگیانم دەگاتێ • لەسەر پێڕەوەکەی خۆیان بەتەنیشت یەکەوە
دەڕۆیشتن ، بێ‌ئەوەی ئاوڕ لە من بدەنەوە ، بە یەك‌دەنگی‌یەکەی
خۆیان ووتیان :

ــ مەباحیس ، تیشکی بگرێتە هەرکەس دەیکوژێت ، مامۆستا زیاد
ئاگات لە خۆت بێت ، با نەزانن هاتوویتە ئەم وولاتە •

پاش چەند ساڵێك ( ن ) ی هاوڕێی میسریمم دی ووتی :

ــ ساڵیان نەبردەسەر ، لە دارو بەردو لە هەوای کراوەش کەوتنە
ترس •• نازانم ماون یا نا •• بەڵام دەزانم هەردووکیان برانە
عەسفووریە ، برانە شێتخانە •

ئەوسا کە هەموو پێکەوە بووین‌و بۆ خۆشی‌و گاڵتە قسەی
ڕۆژانەی جووتە برامان دەگێڕایەوە ، زۆرجار ( ن ) بە ئاواتی
دەخواست لە خۆشی‌و ئاسوودەییدا لە وولاتی خۆیان یەك بگرنەوە تا
بزانێ چ‌حاکمێکن •

(ن) نە ترسنۆك بوو ، نە برای جمکی یەك ڕەنگ‌و یەك دەنگی
خۆیی هەبوو ، نە دەنگی نەلەرزیوی کەرەسەی گاڵتە بوو •••
کەچی ئەویش گەیێندرایە ئەو شێتخانەیەی ئەوان ، ئێستا نازانم ئەوان
ماون یا نا بەڵام شەهیدبوونی ( ن ) ـ فرمێسکێکی‌تری کۆتایی باسی
گاڵتەجاڕی چەوساندنەوەو زۆرداری‌یە •••

بۆ سەر گۆڕی ، چەپکێ گوڵ‌و چەپکێ نێرگز •
مەرگتان نەبینم هەرگیزاو هەرگیز ••

# دایــك

جمال محمد اسماعیل

ڕووبار هاژەت بوەستێنە •••
شەماڵ شنەت خەفەخان کە !
بەهار ئارایش بسڕەوە !•
بۆ نازانی ؟!
ڕۆڵەی نەبەز •••
لە سمکۆڵی پەلاماردا ••
لە حیلەی تیژڕەوی غاردا ••
کاسەی ئاڵی دەبەشیەوە ••
بە ڕەشماڵانی هەواردا ••

★ ★ ★

دایکە هەناسەت سوار نەبێ ••
ئارام دڵت لێدانەوە ••
شوانکارەکەت ڕانەمەڕی پێش خۆی داوە ••
دەیەوێ لەسەر کانیی ڕون •••
ئاوی ژیان بخواتەوە •••
تا تینوێتیی
زێی کۆڵنەدان ••

بیر باتەوە ••
ڕێ بڕدەکا •،
سنگی دەنێ بە گاشەی ••
ئەستەمو قەوی ••

دار وەکازی کاروانە ڕێی
لێ نەشکاوە ••
دەڕوا ••• دەڕوا ••
بەڵێنە نەیەتە دواوە ••

* * *

شەپۆل تا چاوی لە باران نەتۆرێنێ ••
بڵێسەی ناکوژێتەوە ••
وەك دەنگی ئازادی خوازان ••
لە بیابانا ••
لە تاریکایی زیندانا ••
لە گەرووی شمشاڵی شوانا ••
لەگەڵ سۆز دەزرنگێتەوە ••
تا پەنجەرە ئاسنینەکان •••

دەتوێتەوە ••
تا خەونامەی •••
ئومێدی گرتووخانەکان •••
بۆ بەندیەکان دەژێتەوە ••
تا نامە دووکەڵاویەکان ••
دێڕ بە دێڕو ••• وشە ••• وشە ••

بۆ ئاهەنگی رۆژی « یەلْدا » ••
وەك پشكۆ دەگەشێتەوە ••

★ ★ ★

ئەی دایە گیان !
چاوهەڵێنە •••
لەسەر شانۆی نەمریدا من ببینە ••
وا بووم بە کۆترێکی سپی ••
ڕاسپاردەی تۆو هەموو هەژارەکان ••
ئەدەم لەسەر سینگی خوا ••
ڕاسپاردەی خەوە شینە خەمبارەکان ••
ئەکەم بە دەسکە گوڵی با ••
( ماملێ ) ئاوازی قەتاری بۆ هەڵبدا ••
( مەهاباد ) رەشبەڵەك بگرێ ••
سەرچۆپیەکەی تاکو گردی مامەیارە ••
نەپسێتەوە ••
لەسەر پشتی سیروانەوە ••
بەرنامەی ئاهەنگ بگێڕن بە شاراندا ••
ئەوەی وترا دووبارە نەوترێتەوە ••
هەر بارەشێ •••
چڵێ وەنەوشەی وەراندبێ ••
لە بەرچاوی بەراتێکی بێبەهاردا ••
دیسان لەبیر نەچێتەوە ••

★ ★ ★

ئەمجارە لەسەر گوێسوانەی کۆنگرە نهێنیەکان ••
بڵندگۆیەك ئەچەقێنم ••
بە ڕووی منارەی مزگەوتێ ••
بڵندگۆیەك بۆسەر زەنگی کڵیسایە ••
ئەرزوحاڵێ بۆ بارەگای ••
چی وتەی ئیساو موسایە ••
کام چیرۆکی پڕبەزەیی ••
میعراجو ماچی خودایە ••
چ بەندێکی نهێنی کۆنگرە هەبێ ••
دەیدرکێنم ••
ئەی دایە گیان !••
کەی ئەستێرەی بەختی تیمە ••
کەوتە چاوشارکێی بەهارێ ••
ڕەزە ساواکانی چیا ••
هێشوە ترێی رەنگ شەرابی ••
ئەدەن لە سنگ ••
کەی کازیوە ••
وەك بازی خۆزگە لەبانی •••
زیندانەکانا نیشتەوە ••
لاوژەی کوڕت
ڕمی سەرفرازیی چەقاند ••
پریاسکەی کاروانی خەبات ••
ئەدەین لە بەرۆکی پەری ••

خاتوزین‌و دایکی ئازاد ••
لەجێی بەڵگەنامەو خەڵات ••

★ ★ ★

یەك‌جۆرە هێڵ‌و ئەندازە ••
بۆ « هۆبەی » دوارۆژ دەکێشین ••
دایە یەك ریزی دەسرازە ••
بۆ سەر بێشکەی نەوە دەچنین ••
بەڵام « کووژەکە »ی چاوەزار ••
ئەدەین لە دار ••
بە یاسای پێنووسی بیری ••
دەم رۆژگار ••
تا کۆرپەکەت چاوی شینی ••
بەرز ڕوانی ••
نیگای پێنووسێ بەدی‌کا لەسەر شانی ••

★ ★ ★

دایکە خەفەت مەکەرە کۆڵ ••
بۆ منی ئاوارەو کڵۆڵ ••
من‌و ئازار میانەی ڕێی ••
مەرگ‌و ژینین ••
من‌و برسیەتی پێناسەی •• ،
تەواونەبووی پێکەنینین
گەر من نەبم کێ دڵی زەوی دەربێنێ ••؟ !
گەر من نەبم •• ،

کێ چاوی کێلگە بۆ زۆردار بپرژێنێ ‥ ؟ !
گەر من نەبم ‥ ،
کێ بۆ ژیان مەرگ بکڕێ ‥ ؟
گەر من نەبم ‥ ،
کێ هەورازی مێژوو ببڕێ ‥ ؟ !
گەر وابێ دایە فرمێسکت بسووتێنە ‥
بۆ گوڵو گوڵدانت مەگری ‥
هەنیسکت لە گەرووی تاسە بخنکێنە ‥
وا چاکە وەك مۆمی تەمەن ‥ ،
لەسەر گۆڕی هەر نەمرێکدا گڕ بگری .

---

من ئەو دیلەم کە دیل‌کەری زۆردارم
دڵی لەبەر گوڕی ناڵەم ئەلەرزێ ؛
تا شرپتر کا کەڵپەی لەشی زامارم
خۆی خراپتر لەناو خوێنا ئەگەوزێ !

**گۆران**

---

# وتەیەکی مێژوویی پڕماناو بەنرخ

غەفوور میرزا کەریم

پاش ڕاپەڕینەکەی ٦ی ئەیلوول‌و دوای ئەو هێرشە ناڕەوایەی کە حوکوومەتی تازەی عێراق کردیە سەر جووڵانەوەی میللیی کورد ، بەنیازی پینەو پەڕۆ کردنی ئەو بارو دۆخە لە گرێژنە دەرچووەی هاتبوە کایەوەو بۆ کپ‌کردنەوەی ئاگری قین‌و تووڕەیی کۆمەڵانی خەڵك بەرابەر پەیمانی دیلایەتیی ١٩٣٠و دڵنەوایی کردنی گەلی کورد ، مەلیك فەیسەلی یەکەم لە ٣ی حوزەیرانی ١٩٣١دا لە بەغداوە بەرەو کوردستان بۆ مووسڵ کەوتەڕێ • پاش چاو پێکەوتنی کاربەدەستان‌و پیاوماقووڵانی ئەوێ‌و گفتوگۆ لەگەڵ کردنیان ، بەرەو هەولێرو کەرکووك دێ‌و لە ١١ی حوزەیراندا ئەگاتە سولەیمانی • لەم‌ڕۆژەدا دەزگای میری لە شارەوە لەگەڵ پیاوماقووڵان‌و سەرەك هۆزەکان‌و نوێنەرانی خەڵك بۆ پێشوازی‌کردن‌و بەپیرەوەچوونی مەلیك ، تێکڕا بەرەو دەربەندی بازیان (١) کەوتنەڕێ •

---

(١) جاران باوبوو کە پیاوێکی گەورە بهاتایە بۆ سولەیمانی ، لە دەربەند بازیان خێوەت‌و بارەگا بۆ حەوانەوەی هەڵئەدراو خەڵکی پێشوازی‌کەریش لە سولەیمانی‌یەوە تا ئەوێ بەپیریەوە ئەهاتن‌و پێکەوە ئەگەڕانەوە بۆ شار •

مستەفا پاشا یامۆلکی وەك گەورە پیاوێك‌و ڕۆشنبیرێکی کورد ، لەگەڵ ئەحمەدی عەزیز ئاغاو دەستەی تایبەتیی خۆیدا دێت بۆ تەیناڵ‌و لەناو ڕیزبوواندا جێگای تایبەتیی خۆی دەگرێ •

کە مەلیك لە ئوتۆمۆبیل دائەبەزێ‌و ئەیەوێ لەگەڵ پێشوازی‌کەران دەست‌و تەوقە بکا ، لە دوورەوە چاوی بــە یامۆلــکی ئەکەوێ • گوڕ ئەداتە خۆی‌و زۆر بەگەرمەوە بەرەولای ئەکشێ‌و باوەشــی پیـا ئـەکاو دەستی ئەگوشێ‌و قۆڵ ئەکا بەقۆڵیا ، بەچەشنێ کە ئەم هەڵوێستەی مەلیك سەرنجی تێکڕای پێشوازی‌کەران ڕائەکێشێ‌و لەناو خەڵکەکەدا دەنگێکی گەورە ئەداتەوەو ئەبێتە مایەی باس‌و خواسی ڕۆژو مایەی سەرسووڕمانی خەڵکی •

یامۆڵکی ، بۆ لێکدانەوەو ڕوون‌کردنەوەی ئەم هەڵوێستەی مەلیك بەرانبەری‌و بۆ ڕەواندنەوەی ئەو تەپ‌و دووکەڵەی کە لە مەیدانی پێوەندی نێوانیانا هاتبوەدی ، ئەکەوێتە قســەکردن‌و هەڵڕشتنی داخــی دەروونــی پڕمەینەتی خۆی بۆ هاواڵەکانی‌و ، بە ئاخ‌و ئۆفەوە بەم‌شێوەیەی خوارەوە بیروڕای خۆی دەرئەبڕێ :

« کوڕینە ! ئەم کوردەی ئێمە ئەوەندە بەدبەختن، هیچ سەرسووڕمانێ لەوەدا نابینن کە من چــووم بەپیر مەلــیکەوە ، کەچی ئــەو هەڵوێستەی مەلیك ، دەست‌گوشینی یان قۆڵ‌کردنی بەقۆڵماو ڕێز گــرتنی بەرابــەرم سەرنجیان ڕائەکێشێ‌و ئەبێتە مایەی سەرسووڕمانیان » •

بەڕاستی یامۆلکی بەم قسەیەی نیشانەی بەڕاستی پێکاوە • لە ناخــی دڵیەوە بەزەیی بەڕادەی نزمی هوشیاری‌و کزیی تێگەیشتنی کۆمەڵانی خەڵکیدا هاتوەتەوە کە لەتوانایاندا نی‌یە ڕووداوو کێشەکانی کۆمــەڵ لە

هەمــوو ڕوویەکیانــەوە بیبینن‌و بەدروستی لــە هەمــوو سەرێــکەوە هەڵیانسەنگێنن‌و مافی ڕەوای خۆیان بە باشی بدەنێ • زوبانی حاڵی یامولکی لێرەدا ئەڵێ : خۆزگە ئەم خەڵکە لەناخی دەروونیانەوەو لە ناوجەرگەی بــارو دۆخ‌و ڕوانگــەی بەرژەوەنــدی گشتی‌یــەوە بــۆ هەڵسەنگاندنــی ڕووداوەکان ئەچوون •• خۆزگە مافــی تەواویــان بــە پیــاوی گەورەو ڕۆشنبیری خۆیان ئەداو بە باش هەڵیان ئەسەنگاندن‌و لە جێگای تایبەتی‌و سروشتیی خۆیانیانا دائەنان‌و ڕێزیان لێ ئەگرتن •

بەڵێ ڕاستە هاتنی مەلیك بۆ لای یامولکی لەپێش هەر کەسێکی‌تر داو ڕێزگرتنی لێی ، بە کردەوەیەکی شایستەو بایەخدار دائەنرێ‌و ، لــە بواری دیپلۆماسی‌یەتدا بە هەڵوێستێکی زیرەکانە دائەنرێ بــۆ ڕاکێشانــی دڵی خەڵك بۆ لای مەلیك‌و ، لەدواییــدا لــە پایــەو پلــەی زیــاد ئەکاو بەرزی‌ئەکاتەوە لە دڵی خەڵکدا، بەڵام ئەمە هەمووی تەنها ڕووی ڕووکەشی مەسەلەکەیەو ڕووە ڕاستەقینەکەی نی‌یە • پێویستــە هەندێ ڕاستیی‌تــر بزانین‌و ڕوون بــکەینەوە کــە یامولــکی لەبــەر بێ‌فیزیــی خۆی باسی نەکــردوون‌و ئاشــکرا کردنیانــی خستووەتــە ئەستــۆی ڕۆشنبــیران • بایەخدارتریــنی ئــەو ڕاســتی‌یانە ئــەوەیە یــامولــکی وەك کوردێــکی بێ‌پشت‌وپەنا بە شان‌و بازووی تایبەتیی خۆی‌لە تورکیادا گەیشتبوە پایــەو پلەیەکی بەرزی ئەوتۆ بەهۆیەوەو لەڕێــگەیەوە شــیرازەی دۆستایەتیی‌و ئاشنایەتیی لەگەڵ شازادە فەیسەڵ دروست‌کردبوو ، لەکاتێکدا کە فەیسەڵ بەهۆی پایەی شاهی‌و ئایینیی بنەماڵەکەیەوە بە بڕیاری تایبەتی‌و سەرپەرشتیی دەوڵەتی عوسمانی دەرگای خوێندنی بەرزی بۆ کرابوەوە • جا ئەگەر فەیسەڵ ببێتە مەلیکی عێراق‌و لە هەڵوێستێکی‌وادا ڕێز لە کۆنە ئاشنایەکی

پایەبەرزی خۆی بگرێ بۆچی ئەبێ ببێتە مایەی سەر سوورمانو سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی؟ ڕاستترو گونجاوتر ئەوەبوو لە ڕوانگەیەکی ترەوە خەڵکی ئەم ڕووداوەیان هەڵسەنگاندایەو بە چەشنێکی تر بیریان لێ بکردایەتەوە ، یا بڵێین پێویستبوو هەڵوێستی یامولکیو پێشوازی کردنی لە مەلیك بە نادروستو نەگونجاو بهاتایاتە بەرچاو •

## ڕوون کردنەوە

وتاری « یەك دوو وشە دەربارەی ئەدیبێکی شۆڕشگێڕ » کە لە ژمارەی پێشوودا بڵاوکرایەوەو لەسەری نووسرابوو «هەژار سورمێ» کردوویە بە کوردی ، نووسینی خۆیەتیو وەرگێڕان نییە • ئەو دوو شیعرەش کە لە وتارەکەدا بوون هی ( سامی عەودالّ )ن •

# تیشکی ئومێد ئاوا نابێ

**عەزیزی مەلای ڕەش**

تەمەن ڕۆیی نەمدی جارێ ئاهەنگێ خۆش
ساتێ لە چاو بزر نەبوو دێوی ڕەش‌پۆش

کەلی جەزم تەمتوومانێ وا دای گرتووە
تاکو ئێستا چەشەی شادیم نەچەشتووە

لە جیهانی کارەساتا من تەنیامە
تەنیا هێزی هەستی دەروون پەسارگامە

فریاد ڕەسمە لەسەر چەقی ڕێگەی نەهات
پاڵە پەستۆی جەستەکەمە بەرەو ئاوات

بۆیە دەڵێم : هەتاکو ئەو هەستە مابێ
تیشکی ئومێد بە هیچ هێزێ ئاوا نابێ

# رووگەی رەوا ٠٠ !

مدحت بێخەو

هێند نزیـکی ٠٠
هەڵاوی ناخی دەروونت دەمسووتێنێ
هێندەش دووری
تانۆکی چڕی دڕکەزێ
ناهێڵی چاوانی شەیدام
بەشەکانی باخی سینەت تێر ببینێ
ئەی رووگەی پیرۆزی ئەوین
سیامەندو مەمی دڵ پشکۆم
شەیدای ئەو باڵا جوانەی تۆم
بەڵام چیکەم بۆم ناڵوێ
بێ‌سروە ٠٠ تێر تێر بتدوێنم ٠ !
ملوانکەی مرواری شیعرم
لە گەردەنت بئاڵێنم
دڵگیر مەبە ڕووگەی ڕەوا
گەرچی ڕێگەی ژوانت ( وەی )٠
لەدوای یەزدان
سوێندم بە تۆیە تۆی گیان
یان مەرگ یـان
بۆ تووی نەوبووك
کراسێکی هەرد گوڵاڵەو لالە هینان ٠!

# قــەڵەم

جەزا عەلی ئەمین

( ١ )

قەڵەم زمانی دڵـە
وشەشی پەڕەی گوڵە
کاتێ دەگاتە کاغەز
گوڵاوێ دەپرژێنێ
نەك ڕۆژێكو دوانو سیان
تا دێر زەمان دەمێنێ

( ٢ )

قەڵەم زمانی بیرە
بۆ دوژمن وەکو تیرە
ئەوکەسەی دڵی رەش بێ
بۆ دوژمنان چاوەش بێ
وشەکانی زوڕنا بێ
دەنگی دۆڕانی تیابێ

پیتەکانی زوو دەمرێ
هەر شەرمەزاری دەگرێ

( ٣ )

منداڵینە گەورە بوون
ئێوەش وەکوو یێکەس بن
قەڵەم لە دوژمن دادەن
پەڵی گەورەی پێدا دەن

---

من سەربازی ئامانجێکم : پیرۆزە ،
فیداکاری ڕێگایەکم : بێگەردە ،
ڕەنجێك ئەدەم ڕەنجی پیاوی دڵسۆزە ،
لە ڕێیەکا بێباك ئەمرم : ڕێی مەردە ! ..

گۆران

---

# البيان الختامي للملتقى الثاني للقصة الكردية

## المنعقد في اربيل في ١٧ ـ ١٩/٨/١٩٨٢

تحت شعار « ملتقى القصة الكردية ملتقى الاقلام العراقية الخيرة من اجل بناء عراق مزدهر » ، انعقد في الفترة من ١٧-١٩/٨/١٩٨٢ في اربيل الملتقى الثاني للقصة الكردية بمبادرة من الامانة العامة للثقافة والشباب في منطقة كردستان وبالتعاون مع اتحاد الادباء الاكراد وساهم فيه اكثر من ستين قاصا وناقدا قصصيا من منطقة كردستان ذات الحكم الذاتي ومن انحاء اخرى من القطر ، كما حضره واشترك في مناقشاته عدد كبير من الحضور من اعضاء الاتحاد وغيرهم •

وقد افتتح الملتقى بكلمة من الامين العام للثقافة والشباب في منطقة كردستان ذات الحكم الذاتي الاستاذ محمد امين محمد احمد فأشاد في كلمته بالملتقي وتمنى ان يتعاقب عقد امثاله وان يأتي كل منها بحصيلة اوفر لخدمة الادب الكردي عموما والقصة الكردية خصوصا ، كما ذكر ان عقد هذا الملتقى واضرابه من مهرجانات ثقافية وأدبية في منطقة كردستان انما هو ثمرة يانعة من ثمار الحكم الذاتي الذي تم تطبيقه لاول مرة في العراق في ظل ثورة السابع عشر من تموز وقيادة الرئيس المناضل صدام حسين •

كما ألقى رئيس اللجنة المشرفة على الملتقى نائب الامين العام للثقافة

والشباب الاستاذ محمد محي الدين كلمة اخرى ، وتلاه الاستاذ محمد الملا عبد الكريم نائب رئيس اتحاد الادباء الاكراد فألقى كلمة .

وفي ايام الملتقى الثلاثة تليت قصص ودراسات نقدية عديدة نوقشت باسهاب ، باشتراك عدد كبير من الحاضرين ، وأغنيت بحثا وتعقيبا . ففي اليوم الاول من ايام الملتقى تحدث القاص محمد مولود ( مم ) عن تجربته القصصية ، وتلا القاص رضا سيدگول قصته المعنونة ( الحلم والحزن ) التي قيمها الناقد فوآد مجيد مسري [ تلي تقييمه بالنيابة عنه ] ، وقدم القاص رؤوف حسن بحثا بعنوان ( المحلية في القصة الكردية ) . وفي اليوم الثاني قدم الناقد ناصر يوسف بحثا بعنوان ( قراءة في عالم جليل القيسي القصصي ) ، وقدم الناقد محمد سعيد حسن بحثا بعنوان ( البطل والحدث في القصة الكردية ) ، وتلا القاص جلال محمود علي قصة بعنوان ( العروسة والثلج ) ، عبدالله السراج قصة بعنوان ( ابراهيم شوراوي )، ورشيد فندي قصة بعنوان ( مهمو ) ، وقد قيم القصص الثلاث الناقد حسين عارف ، كما قدم الدكتور نافع عقراوي بحثا بعنوان ( الاغتراب في القصة الكردية ) ، وفي اليوم الثالث والاخير تلا القاص مصطفى صالح كريم قصته المعنونة ( الطيور المهاجرة تعود ) والقاص رؤوف بيگەرد قصته المعنونة ( الصقر ) والقاص عبدالله عزيز خالد قصته المعنونة ( حفل راقص في ليل هذه المدينة ) ، وقيم القصص الثلاث الناقد رؤوف عثمان . كما قدم الناقد حسن عباس جاف بحثه المعنون ( البطل في قصص لطيف حامد) وتليت في هذا اليوم كذلك قصة محمد صالح سعيد المعنونة ( لوحة قديمة لمسار قافلة ) ، وقصة صلاح شوان المعنونة ( النجمة العالية ) وقصة سلام منمي المعنونة ( السكرتير ) ، وقيم القصص الثلاث الناقد اكرم قرەداغي، كما القى عبدالرزاق بيمار بحثا بعنوان ( قراءة نقدية لقصص مجموعة « الجسر » ) .

وجرى كذلك في هذا اليوم تكريم رواد القصة الكردية الاوائل جميل صائب ، پيره ميرد ، محمد علي كوردي ، علاء الدين سجادي وشاكر فتاح ، كما كرم كذلك القاص الكردي الكاتب بالعربية عبدالمجيد لطفي • كان تكريم هؤلاء من الامانة العامة للثقافة والشباب • كما قدمت ايضا هدية الاستاذ بابكر محمود رسول وزير العمل والشؤون الاجتماعية الى اربعة قاصين واختير لهذه الهدية كل من رؤوف حسن وعبدالله السراج وحسن جاف وكذلك الاستاذ جليل القيسي لاهتمامه الخاص بالقصة الكردية ومتابعته لتطورها وحضوره الدائم لملتقياتها • وكرم الاستاذ بابكر محمود رسول وزير العمل والشؤون الاجتماعية كذلك الامانة العامة للثقافة والشباب ومديرية الثقافة الجماهيرية في اربيل بهديتين تقديرا لجهودهما في اعداد هذا الملتقى •

* * *

ان المشتركين في الملتقى الثاني للقصة الكردية يثمنونه عاليا ويثمنون النتائج التي تمخض عنها • فقد امتازت الدراسات التي قدمت فيه بالرغم من كل ما لاحظ عليها المناقشون والنقاد من نواقص وثغرات بأنها كانت من صميم ما يجب ان يدرس من جوانب القصة الكردية ، كما كانت القصص المقدمة دليلا على تطور القصة الكردية وعلى تطور الفن القصصي لدى القاصين الاكراد • والملتقى رغم انه عقد في فترة زمنية قصيرة بعد بروز الفكرة الداعية الى عقده مما يترك آثاره على الاعداد له ولا سيما من حيث توفر الوقت الكافي للقاصين والناقدين ، الا انه مع كل ذلك كان ملتقى ناجحا وقد تميز بالحرارة والحيوية والجدية • واننا لندعو الى تمحيص الخبر المتراكمة لدينا منذ عقد الملتقى الاول ولحد الان للاستفادة منها بصورة حية للاعداد للملتقى الثالث والتحضير له قبل موعده بوقت مناسب •

ان بحوث الملتقى وكذلك القصص التي تليت فيه ، تعطينا الحق لنقول لقد غدا القاص الكردي والناقد الكردي مهتما اكثر من اي وقت مضى بالالتصاق بهموم الشعب وطموحاته الى جانب التطلع المستمر للاستفادة من التراث القصصي وتطور الفن القصصي في العالم وفي المنطقة العربية بالذات حيث ان اللغة العربية ما تزال الجسر الرئيسي الذي يربط معظم كتاب وقراء شعبنا بثقافات العالم •

واننا اذ نؤكد على هذه النقطة ، نود كذلك ان نركز في سبيل ضمان سير هذا الخط السليم على امور حيوية لا يتم لنا بدونها تحقيق ما نريده• فمع إن الاهتمام بالانفاق على شؤون الثقافة الكردية تجاوز بقدر محسوس ما كان عليه في الماضي ، الا اننا وبسبب من التخلف الثقافي المتراكم في الشعب الكردي والوضع المالي للمثقفين الاكراد ، نؤكد على ان من الضروري انفتاح الجهات الثقافية الرسمية اكثر بكثير مما هو جار الان على الانفاق على النشر باللغة الكردية • اننا نؤكد على ضرورة توفير الوسائل الطباعية المتطورة في منطقة الحكم الذاتي وعلى تقديم التسهيلات الكافية لتمكين المثقفين الاكراد من نشر نتاجاتهم • وبهذا الخصوص نود ان نشير الى قيود الرقابة اذ يجب الاستعاضة عنها باي اجراء يخفف الصعوبات التي تعترض طريق المؤلف في هذا السبيل •

لقد غدا الوضع بحيث اضحى من الصعب بالنسبة لكثرة من المؤلفين ومنهم القصصيون نشر مؤلفاتهم بانفسهم ، وغدا تدخل الدولة لتولى هذه الشؤون امرا شبه محتم • وازاء ذلك وفي سبيل اتاحة الفرصة لكل الزهور

لان تتفتح ، نرى من الضروري توفير نظرة اكثر شمولية في التعامل مع الكتاب ، وان تلقى جانبا بعض النظرات المتزمتة التي قد نلقاها هنا وهناك مع هذا الطرح او ذاك لدى هذا الكاتب او غيره • ومن البديهي اننا نتحدث هنا ضمن الاطار الذي يجمعنا جميعا الا وهو الاخلاص للوطن وللشعب وقضية الثورة وللمثل الانسانية العليا التي يطمح اليها كل كاتب خير وشريف في جميع اصقاع هذه الارض •

لقد نوقش في الملتقى ، اكثر من مرة ، موضوع اطلاع الكتاب من اخوتنا العرب على النتاج لقصصي والنقدي الكردي وتونج الموضوع من جوانبه العديدة • ان المشتركين في هذا الملتقى يودون ان يؤكدوا هنا على الشيء الاساسي في الموضوع وهو ايجاد منهج مركزي من قبل الدولة وبالتنسيق مع اتحاد الادباء الاكراد في هذا الشأن بغية التمكن من اصدار مجلة ثقافية عربية اللغة كردية المحتوى تتضمن ـ ضمن ما تتضمن ـ القصص الكردية المترجمة ، وكذلك اصدار مجاميع قصصية كردية مترجمة الى العربية في السنة مرتين مثلا • كما نأمل ان تشتمل المجلات العراقية التي تصدر باللغات الاجنبية على نماذج للأدب الكردي قصة وشعرا وعلى بعض التحدث عنه ، فذلك اقل ما يجب لتعريف ادبنا بالشعوب الاخرى التي تطلع من خلال الاصدارات العراقية على واقع قطرنا العزيز •

ويدعو المشتركون في الملتقى الى عقد ملتقى خاص لدراسة الفولكلور الكردي في العام المقبل لما لذلك من اهمية بالغة •

ان المشتركين في الملتقى يؤكدون مرة اخرى التزامهم بنهجهم الثابت في تعزيز الوحدة الوطنية وتمتين عرى الاخوة بين الشعبين العربي

والكردي وسائر الاقليات في وطننا ، وفي السعي لضمان مزيد من الازدهار لعراقنا الحبيب من خلال افكارهم واقلامهم ولترسيخ الحكم الذاتي لشعبنا الكردي اكثر فأكثر • وانهم ليؤكدون على ضـرورة التسـلح بالسـلاح الفكري والثقافي وتطوير مواهبهم وامكاناتهم ومواكبة التطور العالمي للفن القصصي ، وشعارهم : الأدب في خدمة الشعب • في خدمة الحقيقـة ، في خدمة الجمال والمثل العليا ، في خدمة قضية التقدم ••••••

والى الملتقى أيضا في ملتقى جديد !

★ ★ ★

# پێڕست

---

لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدا ژمارە (٢٤)ی ساڵی ١٩٨٢ی دراوەتێ

# « الكاتب الكردي »

مجلة « نووسەری کورد »

## مجلة اتحاد الادباء الاكراد في العراق

العـدد ( ١٠ ) ، الدورة الثانيـة ، كانون الاول ١٩٨٢

رئيس التحريـر

الدكتـور عزالدين مصطفى رسـول

سكرتـير التحرير

ممتـاز الحيدري

الادارة

بغـداد ـ الوزيريـة

مقـابل كلية التربية الرياضيـة ـ مقر جمعية الثقافة الكردية

# THE KURDISH WRITER

BULLETIN OF
THE UNION OF THE KURDISH WRITERS IN IRAQ

No. ( 10 ) Second Period, December 1982

EDITOR - IN - CHIEF :
Proffesor - Ds. C. : IZZADIN MUSTAFA RASOOL

DEPUTY EDITOR - IN - CHIEF :
MUMTAZ HAYDARI

Office : BAGHDAD, WAZEERIYYAH, OPPOSITE COLLEGE OF PHYSICAL EDUCATION, HEADQUARTERS OF THE KURDISH CULTURAL SOCIETY.